

# نیشتمانی بێ میدیا

تێبینی، بۆچوون و ڕەخنە سەبارەت بە ڕاگەیاندنی کوردی

سیروان ڕەحیم





ناوی کتێب: نیشتمانی بێ میدیا

نووسینی: سیروان رەحیم

بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٨٣٨

پیت لێدان: هۆشەنگ حەمەدەمین

هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل

دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم

بەرگ: مریەم موتەقییان

چاپی یەکەم، ٢٠٠٨

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٩٠٧ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

بۆچی کوڕێکی وا نییە هەستێتە سەر پێ
بزانێ چۆن کە هەر کەس کەوتنە سەر پێ
بکا سەیری جەریدە و حاڵی میللەت
کتێبی تازە و تاریخی دەوڵەت

حاجی قادری کۆیی

تا ئەو دەمەی مرۆڤ کەسێکی ناچاری بێدەنگی کردبێت، ناتوانێ بڕوای پێ بێنیت.

کریستۆفەر دارلینگتۆن مۆرلەی ٥/٥/١٨٩٠-
١٩٥٧/٣/٢٨ نووسەر و وەشانکاری ئەمەریکایی

ئەوەی تۆ دەیڵێیت، من نەفرەتی لێ دەکەم، بەڵام لەپای ئەوەدا تۆ بتوانیت بیڵێیت، هەموو ژیانم پێشکێش دەکەم.

فەیلەسووفی فەرەنسی ڤۆڵتێر
١٧٧٨/٥/٣٠ - ١٦٩٤/١١/٢١

پێوەندییەکان لەوێدا لە باشترین ڕەوشدان، لەو شوێنە کە ڕۆژنامەوانەکان دەتوانن هەموو ئەو شتانەی مەبەستیانە بینووسن، هاوکات لەو شوێنەی کە سیاسەتوانان هەموو شتێک ناکەن، کە ڕۆژنامەوانەکان دەینووسن.

سیاسەتوانی ئەڵمانی مانفرێد رومەل ١٩٢٨

هەرگیز ناحەزانە باسی مرۆڤێک مەکە، ئەگەر لە باسکردنەکەی دڵنیا نیت، ئەگەر دڵنیاشیت، لە خۆت بپرسە: بۆچی من ئەم باسە بکەم.

**فەیلەسووف و نووسەری سویسری یۆهان کاسپار لاڤاتەر ١٥/١١/١٧٤١-٢/١/١٨٠١**

# پێشەکی

لە وتەیەکدا سەبارەت بەکاری ڤ.د.ڕ*، کلاوس بۆخەنەک، بەڕێوەبەری بەشی هەواڵ لە ڕادیۆی ڤ.د.ڕدا گوتی: چۆن لێرە (ئەڵمانیا) خەڵک پێویستییان بەبیمەی تەندروستی** هەیە، بەو جۆرەیش پێویستییان بەڕاگەیاندن هەیە. ڕاگەیاندنی سەربەخۆ و بێلایەن.

بەڵام ئایا ئێمەی کورد ڕاگەیاندنمان هەیە؟ بێگومان نەخێر. ئەوەی هەمانە شتێکی دیکەیە. ئەوەی هەمانە هەرگیز نابێت بەو بیمەیەی پێویستە هەبێت.

سالانێکی زۆر نییە ئێمە بەمیدیا ئاشنا بووین. میدیایەک کە زانیاری بەئێمە دەبەخشێ، ئامێری دەستی یەکێک لە ڕێژیمە ترسناکەکان بوو. ڕێژیمی بەعس ڕاگەیاندنی بەجۆرێک دزێو کردبوو

---

(*) ڤ.د.ڕ: کورتکراوەی Westdeutscher Rundfunkە. وێستگەی ئەڵمانەکانی ڕۆژئاوا. ساڵی ١٩٥٦ دامەزراوە. گەورەترین وێستگەی ئەڵمانیا و یەکێک لە وێستگە گەورەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنە لە ئەوروپا. ژمارەی کارمەندەکانی ڤ.د.ڕ ٤٢١٠ کەسن ساڵی ٢٠٠٧ بودجەیان شەش ملیار یۆرۆ بووە.

(**) بیمەی تەندروستی: سیستەمی پاراستن و گرەنتیی تەندروستییە. هەموو کەس پێویستە ئەم بیمەی هەبێت و لە باری پشکنینی تەندروستییەوە دڵنیا بێت. لە هەندێ وڵات بەشێک لە بڕی تێچوونی نەخۆشییەکەی دەدرێت و لە هەندێ وڵاتی دیکەیشدا هەمووی بۆ دەدرێت. یەکێک لە کارە هەرە پێویست و گرنگەکانە کە مرۆڤ هەیبێت.

کە خەڵک گومـان لە ناوی ڕۆژنامـەوان و ڕاگەیاندن بکات. سـاڵانێکی زۆر ئەو ڕاگەیاندنە کرابوو بەمیکرۆب و دەیانڕژاندە هـەموو شـوێنێکی وڵاتەوە.

بەرانبەر بەو ڕاگەیاندنە ترسناکە ڕاگەیاندنی حزبەکانی کوردستان هەبوون کـە ناچار بوون بەرگـری لە خـۆیان و لە دۆزی کـورد بکەن، دیارە بەشێوازی "شۆڕشگێڕانە". بەڵام کاتێک ئەو حزبانە لە شـاخەوە هـاتنە شـار. زۆر شتیـان نەگۆڕی و زۆر شـتیـان بیـراز نەکرد کـە دەبوو بیکەن، ئەو حـزبانە لەگەڵ هـەواری نـوێدا خۆیان نەگونجاند. یەکێک لە کارە هـەر پێویستـەکان کـە دەبوو بیگۆڕن، ڕاگەیاندن بوو. ڕاگەیاندنی ئەو حزبانـە خۆیان نەگۆڕی، خـۆیان بگۆڕیبا، خـۆیان لەگەڵ سـەردەمدا بیـراز بکردایە، دەبوون بەپاشـخـانێک بۆ کـاری ڕاگـەیاندنی کوردی لە داهاتووی وەڵاتەکەدا. ئەو ڕاگەیاندنە بەجۆرێکی دیکە بوو بەپاشـخـان، پاشـخـانێکی نالەبـار. نالەبارییـەک ئەمڕۆ بەسـیمـای مـیدیای حـزبی و ئەهلییەوە دیارە.

لە ئـەمـڕۆی ڕاگــەیاندنی کـوردیدا دوو مـۆدێلی کـارکـردن هـەیە. یەکـێکیـان مـیـدیای حـزبـی و ئەوی تریان مـیـدیای ئـەهـلی، کە ئەمـەی دووەمیـان هێشتا نـوێیە. ڕاگەیاندنی حـزب ئامانجی دیار و ئاشکرایە، خویـایە چییـە، چی دەکات و چیی کـردووە. بەڵام تا ئێستا ڕاگەیاندنی ئەهلـی ئامـانجی نادیارە. ئـەم ڕاگـەیاندنە نازانـێت یان نایەوێت بزانـێ چی دەکـات. لە وەڵاتی ئێـمــەدا ئەم دوو مـۆدێلەی مـیـدیـای هـەن، بەڵام میدیا خۆی، وەکو کارە پرۆفیشنـاڵ و ئاشکراکەی تا ئێستا نییە.

ئێـمـە نیـشـتـمـانێکمـان هەیە بێ مـیـدیا. تا ئێـسـتـا نەمـانزانـیـوە هەڵسـوکـەوت لەگـەڵ ئـەو بوارەدا بکەین کـە ڕاگـەیاندنـە. هـەردوو

مۆدێلەکە میدیایان وەها شێواندووە، خستنە سەر هێڵی ئاساییی خۆی زۆری کات دەوێت.

ئازادی و دیموکراسی دەتوانن لە ڕێگەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆوە هەناسە بدەن و بەردەوام بژین.

بۆ ئەوەی ئەم ڕاگەیاندنە سەربەخۆیە هەبێت، دەبێت بیرکردنەوە و هزری شیاو هەبێت. ماوەیەکی زۆر ڕاگەیاندنی حزبی (و تا ئێستاش ناو بەناو) شوێنی یەکلاکەرەوە بووە بۆ کۆمەڵێ حیساباتی نابەجێ. نەدەبوو ڕاگەیاندن (با موڵکی حزبیش بێت) ئەو بارە لە خۆی بار بکات. لەو ڕاگەیاندنەدا تەڕ و وشک پێکەوە گڕیان تێ بەر دراوە.

نەک هەر لە بواری سیاسەتدا ئەو ڕاگەیاندنە دیرۆکێکی هەیە خەمگین، بگرە لە بواری کولتوور و ڕۆشنبیرییشدا هەڵەی گەورەی تۆمار کردووە. بەشی کولتووری ئەو ڕاگەیاندنە هێرشی کردووەتە سەر شاعیر، نووسەر و ڕۆماننووسی کورد. دیارە هەموو ئەم شتە خەمگینانە لە هزرێکی ناهۆشیارەوە سەرچاوە دەگرێت، هزرێک نازانێت و حاڵی نییە ئەرکی ڕاگەیاندن چییە.

تا ئێستا نە ئەوانەی کاری ڕاگەیاندن دەکەن "زۆربەیان" نە سیاسەتوانانی کورد "زۆربەی هەرە زۆریان" لە گرینگیی میدیا نەگەیشتوون. یان لێی گەیشتوون و نایانەوێت میدیا ببێت بەوزەیەک لە بەرژەوەندییان بدات.

بۆیە کەشێکی وەها خراپیان دروست کردووە، کەشێکی ئاڵۆزیی خراپ لێک حاڵیبوون، کەشێک میدیا نەتوانێ تێیدا بکەوێتە سەر پێ و هەنگاو بنێت.

سیاسەتوان و دەسەڵاتداری کورد تازە تازە دەیانەوێ "ڕێ و شوێنی گونجاو" بۆ میدیا دابنێن. لە کاتێکدا ئەمە مەسەلەیەکە بڕاوەتەوە و میدیا یاسا و ڕێسای کارەکەی ئاشکرایە. ئەوە چ هزرێکە دەیەوێ دەستکاریی یاسا و ڕێسایەک بکات لە هەناوی دیموکراسییەوە سەرچاوە دەگرێت و دەخوازێت لەگەڵ بەرژەوەندی خۆیدا کارەکە بگونجێنێت. دیارە هزرێکە بەبنەما سەرەتاییەکانی دیموکراسی و پێکەوە هەڵکردن نامۆیە.

پێ دەچێ لای ئێمە تا ئێستا کەس لەوە حاڵی نەبووبێت ڕۆڵی میدیا چییە. بێ ڕۆڵی میدیا قسەکردن لە کرانەوە و دیموکراسی مەحاڵە. میدیا یەکێک لەو ستوونە بەهێزانەیە کە دنیای مۆدێرن و دیموکراسیی مۆدێرن بەرهەمی هێناوە و لەسەری وەستاوە.

دەسەڵاتی سیاسیی ئێمە لە گوڵ کاڵتر لە میدیا وەرناگرێت، لە کاتێکدا ئەرکی میدیا ئەوەیە چاودێر و ڕەخنەگر بێت. میدیا دەبێ بەردەڤکی قسەی ڕاست و زانیاریی دروست بێت. ئەوە تەنیا میدیای دەسەڵاتە دەتوانێ باس لە "دەستکەوتەکانی دەسەڵات، پێشوازییەکانی سەرۆک، کۆبوونەوەگەلی حزبی، حکومی و شتی لەو بابەتە" بکات.

دەسەڵاتداری ئێمە لە ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانان لالووتە، بەڵام چاو لەو مەلایانە دەپۆشێت کە بڵندگۆی مزگەوتەکانیان کردووە بەگەروویەک بۆ دژایەتیکردنی خواستی کورد و هێرشی نابەجێی ڕەگەزپەرستانە دژی نەتەوە و کولتوورگەلی نامووسوڵمان. ئەو خزمەتەی ئەمڕۆ ئەو مەلایانە بەبێگانە و ئەدەبیاتی بێگانەی دەکەن دەگمەن و بێ وێنەیە.

سیاسەتوانی ئێمە بەڕەخنەی نووسەر و ڕۆژنامەوان قەڵس دەبێت،

کەچی لە ئاست قسەی مەلادا بێ خەم و بێ بڕیارە. مەلا لە بڵندگۆی مزگەوتەوە بەکەیفی خۆی هاوار دەکات و پەلاماری نەتەوەی کەونارای جوولەکە دەدات، کەس هیچ ناڵێت و کەس هیچ ناکات. بەڵام ڕەخنەی ڕۆژنامەوان، نووزەی ڕۆژنامە چ هەرایەکی لێ دەکەوێتەوە؟

ئایا بۆ کورد باسکردن و هێرشکردنە سەر "جوولەکە" دیارە بێ هیچ هۆکار و پاساوێکیش، چوونی مێرووڵە نییە بەگژ قوللەیی قافا؟***

ئا لێرەوەیە دەردەکەوێت کە دەسەڵاتدار و میدیاکاری کورد توانای خوێندنەوەی بابەتەکانیان نییە. بەتایبەتی میدیاکاری کورد ئەو بابەتانەیشی بۆ ناخوێندرێتەوە کە خۆی و کارەکەی دەگرنەوە. ئەو دەبێ بپرسێ کە قسەی میدیا زۆرتر بڕ دەکات یان قسەی مەلا؟

گەڕانەوەیەکی خەمگینە، زیاتر لە سەد ساڵ لەمەو بەر کورد مەلای وەکو حاجی قادری کۆیی هەبووە، مەلایەک خواستی بووە "قەبیلی ئەکراد" شتێک بەشتێک بکەن و نەبن "خەرابە ئاباد"، مەلای ئەمڕۆیش بەردەوام مرۆڤی کورد بۆ شتێک هان دەدات کە زۆرتر خەسڵەتی خزمەتکاربوون وەردەگرێت. مەلای کورد ئەوەندە حەزی لە خزمەتکردنی کولتووری بێگانە و زمانی بێگانەیە، نیو ئەوەندە حەزی لە خزمەتکردنی "قەبیلی ئەکراد"ی خۆی هەبووبا، ڕۆڵی زۆر ئەرێنیی لە دروستکردن و سازکردنی کەسایەتیی کورد و کۆمەڵی کوردەواریدا دەبینی. بەڵام ڕەنگبێ ئەو سەرەروەرییە بەگرنگ نەزانێت بۆ خۆی و خزمەتی بێگانەی پێ باشتر بێت.

ئایا دیاردەی "هاواری مەلا و نووزەی میدیا" ئەوە ناگەیەنێت دەسەڵاتدار و بەڕێوەبەرانی ئێمە لە کاری میدیا نەگەیشتوون؟ کەواتە

*** شێخ ڕەزای تاڵەبانی.

خەتای کێیە میدیا دروست نابێت؟ وە دروستنەبوونی میدیا زیان بە کێ دەگەیەنێت؟ دیارە لە ڕەوشێکی وەهادا میدیا دروست نابێت، لە کاتێکدا تەنیا میدیایە دەتوانێ گۆڕانکاری بکات.

میدیای ئێمە ڕۆژگارێک بەسەردەبات کە نە "زۆربەی" ڕۆژنامەوانان و نە "نزیکەی هەموو" دەسەڵاتداران لە گرنگیی کاری میدیا نەگەیشتوون. تێگەیشتن لە کارێک ئەوە نییە بگوترێ "ئەم کارە گرینگە و... " نا، کە لێی حاڵی بووین، دەبێت کاری بۆ بکرێت و کاری پێ بکرێت. تا ئێستا هەمووان باس لە بەدیموکراتیزەکردنی کۆمەڵ دەکەن، باس لە بازاڕی ئازاد دەکەن و باس لە زۆر شتی دیکە دەکەن، بێ ئەوەی کار بۆ دروستکردنی میدیا بکەن، میدیا ستوونی پتەوی ئەو دنیا جوان و نوێیەیە کە دنیای یەکسانی و لێکگەیشتنە. لە کن ئێمە نە ڕۆژنامەوان لەم مەسەلەیە گەیشتووە "چونکە ئەگەر لێی گەیشتبا، بەو جۆرە کاری میدیای بەڕێوە نەدەبرد و ئاوا پیشەکەی ماندوو نەدەکرد"، نە دەسەڵاتداریش لێی گەیشتووە، "ئەگەر لێی حاڵی با بەڕەخنەیەک خۆی قەڵس نەدەکرد و لالووت نەدەبوو".

بەکورتی ئاوی ئەو کارە لێڵ بووە، کە لێڵیش بووە ئیدی مەلەکردن بۆ ئەوانەی نایانەوێت زەلالی و ڕوونی هەبێت فرە لە بارە.

لە مێژە کاتی هاتووە ئەم پرسیارە بکەین: بۆ وزەی ئێمە، سامانی ئێمە بەفیڕۆ دەدرێت؟ بۆ وزە و سامان بەفیڕۆ دەدرێن و میدیا نییە؟ لەپای ئەوەی نیشتمانی ئێمەش نیشتمانێک بێت ڕوون و سپی، دەبێ میدیا هەبێت. میدیامان پێویستە بۆ ئەوەی شتەکانمان وەکو خۆی و لە کاتی خۆیدا پێ بگات.

***

لەم چەپکە تێبینی، بۆچوون و ڕەخنەیەدا، باسم لە هەردوو جۆرەکەی میدیا کردووە کە ئێستا لە لای ئێمەدا هەن، میدیای حزبی و ئەهلی. واتە نموونەکەلم لە هەردوو ڕووبەرەکە هەڵبژاردووە.

هەمووومان دەزانین کێشە زۆرە و توانا کەم، توانای ئابووریی کەم و کادری باش کەمتر، بەڵام ئەمانە بۆچوون و تێبینیی منن سەبارەت بە "شتێک" ناوی میدیامان لێ ناوە، کە ڕاستییەکەی میدیا نییە.

بزووتنەوەیەکە و ناوی میدیای لێ نراوە. لە سۆنگەی ئەوەدا بزووتنەوەکە ببێت بەمیدیا، ئەم تێبینی و بۆچوون و ڕەخنەگەلە نووسراون. دیارە ئەمەی نووسراوە زۆرتر پێوەندیی بەمیدیای نووسراوەوە هەیە. نووسین سەبارەت بەکەناڵگەلی تەلەفزیۆنی کوردی بواری لەبار و دەرفەتی زۆری دەوێت.

## کە میدیا پرسیاری نابێت

کە مرۆڤ لەگەڵ میدیاکاراندا دەئاخڤێ، ئەوەی بیر دەکەوێتەوە، ئەوان خەیاڵیان هیچ فراوان نییە. هەر هەموویان بەردەوام هەمان پرسیار دووبارە دەکەنەوە.

مارلێنە دیتریش ١٩٠١/٧/٢ - ١٩٩٢/٥/٦

ئەکتەر و سترانبێژی ئەڵمانی - ئەمەریکایی

ئەو کاتەی کە میدیا پرسیاری پێ نابێت، ئەو کاتەی ئەو "زمانحاڵە" پرسیار شک نابات یان ناتوانێ پرسیار بکات، ئیتر سەردەمی تەواوی لە گۆکەوتنی زمانی میدیا دەست پێ دەکات، ئیتر سەرەتای مردنی میدیا دەست پێ دەکات. شکانی تەواوی میدیا لەو خاڵەوە دەست پێ دەکات کە پرسیاری نەبێت، یان نەزانێ پرسیار بکات یاخۆ پرسیار دروست بکات. میدیایەکی بێ پرسیار میدیا نییە. میدیای کوردی لەو جۆرە میدیایەیە کە پرسیار شک نابات.

میدیایەک پرسیاری نەبوو هەر چییەکی هەبێت هەر دەسکورتە. هەموو ئەو پرسیارانەی خەڵک دەتوانن بیانکەن، هەموو ئەو پرسیارانەیش کە خەڵک ناتوانن یان هەلی ئەوەیان نییە بیانکەن، دەبێ هەموو ئەو پرسیارانە لە لایەن میدیاوە بکرێن. میدیا بوارێکە بۆ پرسیارکردن.

ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین میدیا سیخناخە بەشتی نا پێویست،

میدیای کوردی خۆی بارکردووه لە شتگەلێک کە دەبێت نەیانکاتە کۆڵ، میدیای کوردی دەبوو پرسیاری هەبا و پرسیاری بکردبا، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەم میدیایە پرسیاری نییە و پرسیار ناکات.

کە میدیا پرسیاری نابێت، ئیدی لەوە حاڵی دەبین ئەم میدیایە توانای بینین و خوێندنەوەی نییە. ئیتر تێ دەگەین ئەم میدیایە خەیاڵی نییە، گەر هەیشی بێت خەیاڵێکە لاواز، خەیاڵێکە چاو کز و لە بازنەیەکی زۆر تەنگدا نەبێت شتگەلی دوور نابینێت. میدیایەکە لە سۆنگەی چاوکزییەوە شتە درشتەکان بەلێلی دەبینێت و شتە وردەکان هەرگیز نابینێت و ناتوانێت بیانخوێنێتەوە.

ئەم قۆناغە قۆناغی گواستنەوە و ژیاندنەوەیەی نیشتمانێکە بەهەموو شتەکانییەوە، قوناغێکی پڕە لە بەرگری بۆ مانەوە لەلایەن هێزە کۆنەپارێزەکان و پڕ پڕیشە لە وزە و هەوڵی گۆڕانکاری لەلایەن بەرانبەرەکەیانەوە، ئەمە هەر بۆ ئێمە وا نییە و لۆجیکی گۆڕانکارییە لە هەموو ئەو نیشتمان و لە کن هەموو ئەو نەتەوە و گرووپانەی دەژین. قۆناغێکە پڕ لە وردە شووشەی ڕێگا و قۆناغێکە میدیایەکی دەوێ چاو تیژ کە سەرباری شتە درشتەکان هەموو شتە زۆر وردەکانیش ببینێت.

قۆناغێکیشە قۆناغی بەردەوام رامان، رامان لە هەموو شتەکان، چونکە زۆربەیان بەگیان و بەبیری کۆمەڵ نوێن و قۆناغێکە خەیاڵ دەبێ زۆر بەهێزەوە کاری تێدا بکات و پرسیار بورووژێنێت و ئاراستەی بکات. پرسیار سەبارەت بەهەموو شتەکان.

بەڵام چ پرسیارێک؟

ڕاستییەکەی میدیای کوردی زۆر شتی هەیە لە بەرگی پرسیلردا دەیانکات و لە بەرگی پرسیاردا ئاراستەیان دەکات، بەڵام ئەفسووس

کە ئەو شتگەلە نەک پرسیار نین، بگرە شوێنگەی پرسیاریان لە ڕووبەری میدیای کوردیدا تێک داوە.

میدیا دەبێ بزانێ پرسیار بکات، دەبێ بزانێ پرسیارە ڕاستەقینەکان کامانەن. میدیا دەبێ لەوە حاڵی بووبێت سەردەم، ڕووداو و هەڵوێستەکان چ پرسیارێکیان پێویستە. پرسیارە ڕاستەقینەکانی کۆمەڵ کە تژەن لە حەز و ویستی گۆڕان کامانەن. بێ ئەو پرسیارانە هەر شتێکی دیکە کە بەپرسیاری تێ بگەین و وەکو پرسیار ئاراستەی بکەین تەنیا زیانێکە، زیانێکی کوشندە لە پرسیار و لە شوێنگەی پرسیار لە میدیا دەدرێت.

هەموو گۆڕانکارییەکان بەپرسیار دەست پێ دەکەن و پرسیار سەرەتای ئاشکراکردن و هەنگاوی یەکەمی هەموو دۆزینەوەکانە. ئەی بۆ میدیای کوردی پرسیاری نییە؟

ئیسحاک ئاسیمۆڤ نووسەری ئەمریکی - ڕووسی (١٩٢٠/١/٢-١٩٩٢/٦/٤) دەڵێت:

"هەموو شتەکان لەگەڵ مرۆڤگەلی سەردەمی ئاتنیکدا دەستیان پێ کرد، ئەوانەی کە پرسیاریان کرد، مرۆڤ چۆن دەتوانێ کەرەستەکان دابەش بکات. مرۆڤ ئەو کاتە بۆی ئاشکرا دەبێت بەچی دەگات ئەگەر پرسیارە ڕاستەکان بکات."

کەی میدیای کوردی دەگاتە ئەو باوەڕەی پرسیارە ڕاستەکان ئاراستە بکات؟ کە میدیای کوردی ئەوەی کرد دەزانێ لەمێژە دەبوو پرسیارە ڕاستەکان ئاراستە کرابان.

# میدیایەک خاڵی لە زانیاری

ئێمە بە بەشێکی بچووک لە نەزانین، نەزانینێک کە خۆمان
کەڵەکەمان کردوون، دەڵێین زانین.

ئامبرۆسە گەڤینێت بیرسە ١٨٤٢ - ١٩١٤

هونەرمەند، نووسەر و ڕۆژنامەوانی ئەمەریکایی

دەبێ لەوە حاڵی بین و کار بەو پرەنسیپە بکەین هەموو زانیارییەکان لە کن ئێمە نین. دەبێ حاڵی بین بۆچوونەکانی ئێمە زانیاری نین. ئەوانە تەنیا بۆچوونن و پێوەندییان بەهەواڵ، بەخشین و بە ئەرکی ڕاگەیاندنەوە نییە.

میدیای کوردی لێوانلێوە لە "بۆچوون". دیارە میدیای وەها ئامێرێکە وەڕسکەر/ میدیا دەبێ زانیاریبەخش بێت. کە زانیاریبەخش بوو خۆشەویست دەبێت و کاری خۆی بەجێ دەهێنێت. کە زانیاریبەخش بوو هۆگر و کڕیاری زۆری دەبێت. دەبێ ڕاگەیاندن بە بەخشینی زانیاری کڕیار لە خۆی کۆ بکاتەوە، نەک بەمانشێتی پڕ لە گێچەڵ و نووسینی پرۆڤۆکاتیف*، دەبێت میدیا وێڵی زانیاری و هەواڵ بێت پاشان بەزمانێکی شیاوی ڕاگەیاندن بەخوێنەر و بینەری ببەخشێت.

میدیایەک کە تژە بوو لە "بۆچوون" دەکەوێتە هەڵەی گەورەوە. چونکە هەمیشە بۆچوونەکان شرۆڤە و شیکاریی جودایان بۆ دەکرێت. بەڵام

(*) پرۆڤۆکاتیف: وروژێنەر، گێچەڵکار، مایەی هەڵچوون و تووڕەبوونی بەرانبەر.

میدیایەک کە زانیاری بەفاکتەوە بڵاو دەکاتەوە ئیدی وەکو سەرچاوە پیشان دەدرێت و حیسێبی لەسەر دەکرێت. بۆ تاکو ئێستا میدیای کوردی قسە و بۆچوونەکانی بە بەڵگە وەرناگیرێن؟ کێشەکە ئەمەیە میدیای کوردی قسەی بێ حیسێب سەبارەت بەزۆر لایەن و زۆر ڕووداوەوە دەکات.

میدیای کوردی ئەو نەزانینەیش نابەخشێت کە "ئامبرۆسە گەڤینێت بیرسە" ئاماژەی پێ دەکات. میدیای ئێمە میدیایەکە خاڵی لە زانیاری و تژە لە قسەی بێ حیسێب. سەرچاوەی هەواڵ و نووسین لە کن میدیای کوردی بووە بە "وتی وتی". ئەوە هەرگیز کاری میدیا نییە خۆی لەو هەموو زانیاریگەلە ببوێرێ کە ڕۆژانە خوێنەر و بینەر پێویستییان پێ دەبێت و لە بری ئەوە خۆی بەشتگەلێکەوە سەرقاڵ بکات کاری ئەو نییە.

سائول بێلۆڤ** گوتوویەتی:

> کێشەی هەواڵ و ڕاپۆرتی ڕۆژنامە ئەوەیە، کە شتە نۆرماڵەکان سەرنجڕاکێش نین.

دەبێ میدیا خۆی لەو شتە ئاساییانە بپارێزێت، خۆ سەرقاڵکردن بەشتی نۆرماڵەوە، لە دەستدانی شتە گەورەکانە. پێویستە میدیا ئەوە بزانێت کە ئەو زەنگێکی چەند کاریگەری بەردەوام ئاگادارکردنەوەیە، ئاگادارکردنەوە بەزانین و زانیاری.

ئەو ڕاگەیاندنەی کە زانیاری نابەخشێت باشترە بێدەنگ بێت. ئەو ڕاگەیاندنەی زانیاریی نەبەخشیوە و کەسی ئاگادار نەکردووەتەوە

(**) سائول بێلۆڤ "١٩١٥/٥/١٠ - ٢٠٠٥/٤/٥" نووسەری ئەمەریکایی، هەڵگری خەڵاتی نۆبل بۆ ئەدەبیات.

مافی ئەوەی نییە لەسەر ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندن بژمێردرێت.

با ئێمە بێین و چاوێک بەڕۆژنامەگەلی مانگێکی کوردستاندا بخشێنین، دیارە بەچاوی هەڵسەنگاندنەوە. با بزانین لە ماوەی مانگێکدا، تەنیا ڕۆژنامەیەکمان نا، بگرە ئەو هەموو ژمارە زۆرەی ڕۆژنامەی کوردی لە مانگێکدا بنرخێنین و بزانین بەشی ئەو مانگە یان لەو مانگەدا بەشی هەفتەیەک یاخۆ بەشی ڕۆژێک زانیارییان بەخەڵک بەخشیوە؟

کە میدیا لە زانیاری خاڵی بوو ئیتر دەبێت بەجەستەیەکی بێ مێشک. میدیای خاڵی لە زانیاری کارێکە بێ هوودە و بێ واتا. دەبێ ڕۆژنامە وەهای لێ نەیەت وەکو گۆتە*** دەڵێ:

> ئەگەر مرۆڤ چەند مانگێک ڕۆژنامەکانی نەخوێندبێتەوە، پاشان بەسەریەکەوە بیانخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێت، کە چەندێ کاتی لەگەڵ ئەو کاغەزانەدا بەفیڕۆ داوە.

---

(***) یۆهان ڤۆلفگانگ فۆن گۆتە "١٧٤٩ - ١٨٣٢" شاعیر، درامانووس، بەڕێوەبەری شانۆ، سروشتناس، تیۆریسیەنی هونەری و پیاوی دەوڵەتی ئەڵمان.

## ستایشی پێشکەوتنەکانی هەرێم

من هەمیشە لاپەڕەی وەرزشیی ڕۆژنامە لە پێشەوە دەخوێنمەوە، لەبەر ئەوەی تواناگەلی مرۆڤ ڕووپێو دەکات. لەسەر یەکەم لاپەڕە هەمیشە شتە سەقەتەکان دەبیندرێن.

"ئێرل ڤارەن ١٨٩١/٣/١٩ -١٩٧٤/٧/٩"

پارێزەر و پیاوی دەوڵەتی ئەمەریکی.

"سەرۆکی یان بەرپرسیاری.... پێشوازی لە.... کرد" و لە دیدارەکەدا ستایشی پێشکەوتنەکانی هەرێمی کوردستان کرا". ئەمە ڕستەیەکە لەم چەند ساڵەی دواییدا ئەگەر ئامارێکی زانستی بۆ بکرێت، پێم وایە ژمارەی دووپاتکردنەوەی گەلێ درێژ بێت.

"ستایشی پێشکەوتنەکانی هەرێم" بۆ میدیایەک کە لەلایەن حزبەوە دەردەچێ ڕستەیەکە گرنگ، ڕستەیەکە لە ریزی پێشەوەی کاڕ و هەواڵ و چالاکییەکانی ئەو میدیایە، بەڵام ڕاستییەکەی ڕستەیەکە پاڵنەرێکی دەروونیی ئاڵۆزی لە پشتەوەیە.

میدیای ئەو حزبانە گەرەکییانە بەو ڕستەیە گەورەترین "ریکلام" بۆ حزب و ئەو وەزیر و بەڕێوەبەرانە بکەن کە سەر بەحزبەکەی خۆیانن. دیارە ئەوە مافی سروشتیی هەموو حزب و دامەزراوێکە. بەڵام جێگەی داخە بۆ ئەو ڕەوشەی کوردستان بڵاوکردنەوەی ڕستەیەکی "ڕێکلام ئامێز"ی وەها دەقا و دەق دەبێت بەئانتی ڕێکلام "دژە ریکلام".

•

خۆ خەریککردنی میدیایەک بەپێشکەوتنەکانی ولاتێکەوە کە هێشتا "وزە" تێیدا لەوپەڕی لاوازیدایە، خۆ خەریککردنێکی بێ هوودەیە، خۆخەڵەتاندن و هەوڵی خەڵک خەڵەتاندنە. نیشتمانێک کە ئاو و کارەبای نەبێت، یان لە ئاستی زۆر نەویدا دەستەبەر بن، ئاوەدان نییە، نیشتمانێکە ژیان و گوزەران تێیدا شتێکن ناچاری.

لە بری ئەوەی ئەو میدیایە بێت و بە "زمانێکی دۆستانە* بەردەوام باس لە دەستەبەرکردنی کارەبا و ئاو بکات، کەچی دێت و ڕۆژانە "ستایشی پێشکەوتنەکانی هەرێم" دەکات. پێشکەوتنگەلێک کە بەبەراورد لەگەڵ پاشکەوتنەکانیدا یەکجار ئێشبەخشن.

دیارە بەرانبەر بەمە میدیایەکمان نییە "چاودێر" و میدیایەک ئەرکی خۆی وەکو میدیا جێبەجێ بکات. بەرانبەر بەم میدیایە، میدیایەک هەیە کۆڵەوار لە ئاشکراکردنی نهێنییەکان و دەست و پێ سپی لە گیانی ڕەخنە و یاخیبوون لە ستایشەکان. ئەو میدیایەیش کە ناوی خۆی ناوە "میدیای ئەهلی" بەجۆرێک لە جۆرەکان لە گەمەکەدایە. بەشداریکردن لە گەمەکە هەر ئەوە نییە تۆ "لەگەڵ" بێت، بگرە هەندێ "دژبوون"ی بێ پلان و بێ بەرنامە ئەگەر خراپتر نەبێت ئەوە دروست وەکو "لەگەڵبوونەکە" پڕ زیانە.

بەسەر یەکەوە ئەو میدیایەی کە ئەمرۆ ئێمە هەمانە، یان پڕە لە قسەی بێ سەروبەر سەبارەت بە"پێشکەوتنەکانی هەرێم" یاخۆ پڕە لە

(*) وەکو ڕاگەیاندنی حیزبەکان بانگەشەیان بۆ کردووە کە دەبێ ڕەخنە بەزمانی دۆستانە بێت، وەکو ئەوەی ڕەخنە زمانێکی ستانداردی نەبێت و بێین ئەو زمانە بئافرێنین. بەداخەوە لە وەلاتی ئێمەدا کەسێک کە ڕەخنەی گرت دەبێت بەناحەز؟ ئەگەر نا زمانی دۆستانە واتای چ دەگەیەنێت؟

قسه و ڕەخنەی بێ حیسێب بەدەسەڵاتی کوردی. ئایا میدیا بە بەرهەمهێنانی ئەم قسە بێ حسێبانە ناکەوێتە خانەی بێ دەربەستییەکی ترسناکەوە؟ دەبێ میدیا چاودێرێکی بەردەوام ورد بێت بەسەرییەوە دەسەڵاتەوە و جۆری کار و بەڕێوەبردنی هەڵبسەنگێنێت.

پەسنی بێ سەروبەر و بێ بەڵگە قسەکردن بەهەر حزب و دامەزراوێک دەکەونە یەک پۆلەوە لەکاری میدیادا کە ئەویش پۆلێکە لە دەرەوەی پۆلی ڕاستەقینە و پیشەی ڕاگەیاندن.

پۆلێکە دەنگ و ڕەنگی بڕ ناکات و ڕۆشنایی لەگەڵ خۆیدا ناهێنێت.

ڕاستە هەموو حزب و دامەزراوێکی سیاسی میدیا دەکەن بە "ئامێر" بۆ ژەنینی ئاوازگەلێک کە خۆیان پێیان خۆشە، بەڵام دەبێ بەرانبەر بەو ئاوازانەی ئەوان، دەنگی دیکە هەبن، دەنگێک کە لە هزری میدیای پیشەیی و لە بیرکردنەوەی میدیای پیشەییەوە سەرچاوە بگرێت.

بە"ئامێرکردنی" میدیا یەکێکە لە شتە ترسناکەکانی دیکتاتۆران و هەموو حزبە پاوانخوازەکان، هەرچەندە هەموو ئەو "بەئامێرکردنانە" بە ڕیسوابوون کۆتاییشیان هاتبێت ئەوە ناگەیەنێت کە "وزەیەکی زۆر"ی میدیا و خەڵکی بەفیڕۆ داوە. بۆیە هەوڵدان بۆ چەندبارنەبوونەوەی بە"ئامێرکردنی" میدیا ئەرکی لە پێشینەی زۆر کەسە..

✐ با میدیای کوردی میدیایەک بێت بەر لە لاپەڕەی وەرزشییەکەی لاپەڕەی پڕ زانیاری و ڕاستیی یەکەمی بخوێندرێتەوە.

## دەستێکی ناسک وەک لۆکە

ولاتێکم پێ بڵێ کە تێیدا ڕۆژنامەوان و سیاسەتوان پێکەوە هەڵدەکەن، من بە بەڕێزتان دەڵێم لەوێ دیموکراتی نییە.

وەشانکاری بەریتانی هوگ مارلتۆن
گرین "١٩١٠ - ١٩٨٧"

بۆ میدیای کوردی دەست بۆ بابەتە "ناسکەکان"ی ئەم قۆناغە "ناسک"ەی میللەتی کورد نابات؟

پرسیارێکە پێویستی بەوەلامە. دەبێ میدیای کوردی ئەو وەلامە بداتەوە، بەلام ئایا میدیای کوردی وەلامێکی وەها دەداتەوە؟

نەخێر، لە سۆنگەی ئەوەدا میدیای کوردی تەبایە لەگەڵ سیاسەتی کوردیدا، خۆی مولکی ئەو سیاسەتەیە و نەک هەر لە تەکیدا هەڵدەکات بگرە هاوڕێی گیانی بەگیانییەتی، بۆیە ناتوانێ ئەو شتگەلە ناسکە بخاتە ناو بازنەی تیشکاوێژەوە و ڕووناکییان بخاتە سەر.

میللەتێک کارەبای نەبێت، ئاوی نەبێت، مووچەی لە بەغداوە بۆ بێت و "بەرگەی یەک مانگی بێ مووچەیی بەغدا نەگرێت"، میللەتێک پیاز، توور و کەوەری لە مالانی دەر و دراوسێوە فریا بخرێت، میللەتێک پیشەسازیی چرووکی لە ڕێگەی بازرگانی چرووکەوە لە چین و ماچینەوە پێ بگات، ئایا ئەم میللەتە لە تەرازووی هێز و بەرژەوەندی ئەمەریکادا سەنگی چەندە؟

ئایا میللەتێکی وەها دەتوانێ بارتاقای تورک و عەرەب و ئێران سەنگی هەبێت؟ ئایا تورکیایەک هەموو خۆراکی سەربازانی ئەمریکا (لە ناوچەکە) دەستەبەر بکات دەچێتە ئاستی بەراوردەوە لەگەڵ هەرێمێکدا کە چەندین ساڵە هەرچی "پاشەڕۆکی" پیشەسازی و گەندە خۆراکی هاوسێکانمانە بەردەوام بەسەر خەڵکەکەیدا ساغ دەکرێتەوە.

ئایا ئەمە خاڵی ڕامان و قسە لەسەرکردن نییە؟ ئەی بۆ میدیای کوردی دەست بۆ ئەم بابەتگەلە درێژ ناکات؟

ئایا ئەم بابەتە دەست دەسووتێنێت؟

ئایا میدیای کوردی دەستێکی هەیە لۆکە ئاسا ناسک و بەرگەنەگر؟

ئەگەر نا بۆ تا ئێستا باس لەم شتانە ناکرێت؟

میدیای کوردیش دیارە لە هەناوی ئەو ئەزموونەی کوردستانەوە هاتووەتە دەرێ و هاوشانی ئەو گەشەی کردووە، بۆیە دەسکەوتەکانیان زۆر لە یەک دەچن. هەندێ جار بۆچوونی دەسەڵات و میدیا وەکو دووانەن، ئەوەندە لەیەک دەچن بەئاستەنگ لێک جودا دەکرێنەوە کە کامە بۆچوون هی کام لایەنیانن.

ڕۆژنامەوان و سیاسەتوانی وڵاتی ئێمە زۆر پێکەوە تەبا و کۆکن، بەجۆرێک کە بێ یەکتر هەڵناکەن. ئەمە وای کردووە میدیا ئەرکی میدیایی خۆی لە دەست بدات.

ئێستا نەک کاتی ئەوە هاتووە میدیا دەستبەرداری هاوڕێیەتی و چاوشلکانێ بێت لەگەڵ دەسەڵاتدار و سیاسەتواندا، بگرە درەنگە و ئەگەر فریا نەکەوێت نەک دەگوترێ میدیای کوردی نەبوو بەئامرازی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگادا، بگرە میدیا بەر گومان دەبێت، چونکە

کارێک کە پێوەندیی بەسروشت و پرەنسیپی میدیاوە نەبێت و بەنێوی میدیاوە بکرێت زیانی گەلێ زۆر دەبێت، لە داهاتوویشدا لەوە زۆرتر کە ئێستا دەیبینین.

میدیای ئێمە دەزانێت بۆ فرۆکەکانی تورکیا بەو ئاسانی و بێ خەمییەوە دەتوانن کوردستان بۆمبباران بکەن؟ ئەگەر نەزانێت، ئەوە بێ ئاگاییی تا ئەو سنوورە بۆ سروشتی کاری ڕۆژنامەوانی نابێت و ناگونجێت.

٭ ئەگەر دەزانێت و قسەی لەسەر ناکات، ئەوە خراپتر. هەموومان ئەوە دەزانین کە ئەرکی میدیا گواستنەوەی ڕاستییەکانە، ئەی کەواتە بۆ میدیای ئێمە لە درکاندنی هەموو ئەو ڕاستییە زۆر پێویستانەی ڕۆژدا بێ دەنگ و بێ ئەرکە؟

دەستبردن بۆ ئەو ڕاستییانە، پەنجە خستنە سەر ئەو بابەتە دەستێکی دەوێ، بەر لە هەموو حیساباتێک دەبێ پرەنسیپی کاری میدیایی بەهەند بگرێ. دەستێکی دەوێ بتوانێ ئەو بابەتانە بۆ ڕای گشتی بگوازێتەوە، دەستێک نەهێڵێت کەس ئەو ڕاستییانە پەردەپۆش بکات. دەستێک، کە هزرێکی میدیاسازی وەها ئاراستەی بکات بێ ڕاستی و گوتنی ڕاستی هەڵنەکات و کار نەکات.

## میدیای کوردی لە قوتابخانەی لێوەباردا

ڕۆژنامەوانێک کە عاشقی کارەکەی بێت زۆر سەختە بتوانێ ستوونێک بنووسێت بێ ئەوەی لە نەستی خۆیدا گۆڕینی واقیعی مەبەست نەبێت.

ڕودۆلف ئاوگوستاین ١٩٢٣/١١/٥ – ٢٠٠٢/١١/٧" وەشانگەر و ڕۆژنامەوانی ئەڵمانی و دامەزرێنەری گۆڤاری هەواڵئامێزی دێر شپیگل

دەبێ، پێویستە، دەبوایە خۆزگە وایان بکردایە، پێشنیاز دەکەم بۆ دەسەڵاتدارانی کورد، بۆچوونی من بۆ حکومەتی کوردستان ئەوەیە..."، و دەیان دەربڕینی لەو جۆرە بەهای خۆیان لە دەست دا و لە فەرهەنگی دەربڕین و زاراوەکانی ئێمەدا چوونە دەرەوەی بازنەی قسەی حیسێبییەوە.

مجرۆبوونی ئەو پەیڤ و دەربڕینانە دەکەوێتە ئەستۆی گەندەڵکارانی کورد، دەکەوێتە ئەستۆی ئەو کەسانەی کە ئەو نیشتمانەیان نەخۆش خستووە و ئەوانەی کە ڕێگرن لە پێش جووڵە و بزاوی ئەو کۆمەڵگایە. گەندەڵکار هەر ئەوە نییە کە دەست بەسەر سامانی مادیی گەلدا دادەگرێت. شێوە و سیماکانی گەندەڵی فرەن.

لەم نەخۆشکەوتنەی کۆمەڵگادا ڕۆڵی میدیا ڕۆڵێکی بچووک نییە.

میدیای کوردی وەکو زۆر بواری دیکەی کار و ژیان، ڕووبەڕێکە بۆ کاری ناجۆر، ڕووبەڕێکە تێیدا شتە گرینگەکان دەشاردرێنەوە و شتە

بێ بایەخەکان زەق دەکرێنەوە.

✍ میدیای کوردی بۆ بینینی شتە گرنگەکان هەمیشە چاوێکی هەبووە وەکو چاوی مار. چاوی مار چاوێکە یان نابینا یاخۆ زۆر بەلێڵی شتەکان دەبینێت. لە زمانی ئەڵمانی پێناسەیەک بۆ ئەو جۆری بینینە هەیە، "وەک ئەوەی لەو دیوی پەرداخی شیرەوە شت ببینیت" ئیتر دەبێ بزانین پلەی لێڵی لەو بینینەدا چەندە؟.

میدیای کوردی چاوێکی وەهای هەیە، شتەکان زۆر نا ڕوون دەبینێت. کێ دەتوانێ لە کوردستان پێشنیاز بکات ڕەوشی پەروەردە و باری قوتابخانەکان ڕاست بکرێنەوە؟

کەس تا ئێستا نەیتوانیوە قسەیەکی حیسێبی، پێشنیازێکی گرنگ یان هۆکارەکانی چارەسەرکردن بخاتە ڕوو. لە ئامادەنەبوونی کەسدا پرسیار ئاراستەی کێ بکەین؟ بەڵام دەکرێ پرسیار ئاراستەی میدیای کوردی بکەین. بۆ خۆتان بەم کێشە هەرە گرینگەی کۆمەڵەوە سەرقاڵ نەکرد؟ بۆ تیشکتان نەخستە سەر تاریکستانی بواری پەروەردە و فێرکردن لە وەڵاتی ئێمەدا؟ بۆ پۆلە تاریکەکان بەچرای دەرفەتێک کە میدیا هەیەتی ڕووناک ناکرێتەوە؟

قوتابخانە، فێرگە و زانکۆکانی کوردستان لێوبەبار و پەرێشانن. زۆر کەس ئەمە دەزانێت، بەڵام کێ ئەو ڕەوشە چەوتە ڕاست دەکاتەوە و کێ پەروەودە لەم تەنگژەیە دەرباز دەکات؟ چارەسەرکردنی دەردەکە گرنگترە لەم بارەدا، چونکە دەردەکە دەستنیشان کراوە.

ئایا میدیای کوردی ئاگای لەوە هەیە دەسەڵاتداری کورد فریای ئەوە دەکەوێ کە لە تۆماری قوتابخانەدا هەردوو وشە خوێندکار و قوتابی هەبێت، بەڵام فریای پێویستی بەپەلەی خوێندن و پەروەردە و

فێرگاکانمان ناکەوێت.

بۆ ساڵی خوێندنی ٢٠٠٧ – ٢٠٠٨ چەندین "تۆماری قوتابخانە" ڕەت کرانەوە و سەرلەنوێ چاپ کرانەوە، بۆ؟ لەبەرئەوەی دووانەی قوتابی و خوێندکاریی تێدا نەبوو. ئەمە چ بیرکردنەوەیەکی نەخۆشە؟ چ هزرێکی دەردەدارە کە منداڵی چاو گەشی کورد پەروەردە دەکات؟ ئەمانەن چرای ڕووناکی لە مێشکی نەوەی داهاتوومانندا دادەگیرسێنن؟ میدیای کوردی بۆ ئەمە نابینێت؟ بۆ شتە بچووکەکان دەبینێت و ئەم کارەساتانە بەسەر ناکاتەوە؟

ئایا ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو میدیایە ناتوانێ دەست بۆ ئەو بەردە قورسانە ببات؟ ئایا میدیای کوردی تەنیا بەم تۆماری قوتابخانەیە ناتوانێ وا بکات دۆزێکی قانونی لەسەر بکەرانی ئەو کارەساتە بەڕێوە بچێت؟ ئایا تیشک خستنە سەر ئەم کارەساتە نابێتە هۆکاری ئەوەی سەرجەم پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە کوردستان بگۆڕێت؟

کێن ئەوانەی دەبن بە سەبەبکاری ئەوەی سەدان هەزار لاپەڕە فڕێ بدرێت و ئەوەندەی دی سەرلەنوێ چاپ بکرێنەوە، بۆ؟ چونکە دەبێ دووانەی قوتابی و خوێندکار بەجووتە چاپ بکرێن.

ئایا ئەمە هەموو یەکگرتن، تەبایی ماڵەکەمان و ڕێکەوتنی کورد ناخاتە ژێر گومانەوە؟ نەخێر ئەمە گومان نییە، ئەمە بەڵگەی سەلمێنەرە کە ئێمە چەند ناتەباین. بەڵگەی قسە هەڵنەگرە کە ئێمە چەند ناڕاستگۆین و چۆن بەردەوام خۆمان دەخاپێنین و خۆڵ دەکەینە چاوی خەڵکەوە.

بۆ چاوی میدیای کوردی ئەمە، ئەم کارەساتە، کارەساتی پەروەردە و قوتابخانەی لێوەباری کوردستان نابینێت؟

## تۆران لە نیشتمان

دەرکەوتایە ئاوات، هیوا، خەوبینین
پرشنگدارتر لە ئەستێرەی قوبەی شین
گۆران

گۆران شۆفێرە لە یەکێک لە فەرمانگەکانی کوردستان، خێزاندارە، منداڵێکیان هەیە. هاوسەرەکەی ژنی ماڵە. داهاتی مانگانەی گۆران ٢٢٠ ٠٠٠ دیناری عێراقییە (پارەکەی برێمەر). گۆران بەمنی گوت: من گیانم بەوەیە لە ماڵی دایک و باوکم داڵدە دراوم و کرێی خانوو نادەم. دەنا لە برسان دەمرم. بەڵام برادەر ئەوەیش ژیان نییە خێزانێکی زۆر لە ماڵێکدا پێکەوە بژین. گۆران دەڵێ: لەو پێکەوە ژیانەدا هەموو خۆشییەکی ژن و مێردایەتی لەناو دەچێ. ئەو دەڵێ: لە ئەوروپا هەموو کەس دەبێ ماڵی خۆی هەبێت تەنانەت ئەگەر بچووکیش بێت، قسەکەم ڕاست نییە؟ دەپرسێ. گۆران وای بۆ دەچێ کە ئەوروپا بەخۆڕایی بەم بڕیار و شێوازی ژیانە نەگەیشتووە.

گۆران دەڵێ: یازدە کەسین لە ماڵێکدا، یانزە کەس، بەڵام یەک ئاودەست و یەک گەرماومان هەیە. ئەمە چ سیستەمێکی ژیانە ئێمە هەمانە؟ بەردەوام دەبێت دەڵێ: هەرچەندە لە سۆنگەی بێ ئاوی کەمتر گەرماوەکە بەکاردێنین، بەڵام هەموو سبەینێیەک چەند کەسێکی خێزانەکە لە نۆرەگرتنی ئاودەستدا کاتێکی زۆریان بەفیڕۆ دەچێت.

گۆران پێی وایە ئەمەیان خەتای دەسەڵات نییە، بگرە ئێمە وەکو کۆمەڵگە زۆر بواری ژیانمان پڕە لە هەڵە و کێماسی و تا ئێستایش بیر لە چارەسەرکردنیان ناکەینەوە.

قسەکردن لەگەڵ گۆراندا گەشتێکی سەرنج ڕاکێشە بەخەیاڵ و خولیای گەنجی وڵاتی ئێمەدا. ئەو گەنجە ڕووح سووکە لە کۆمەڵناسێکی خۆڕسک دەچێ. ئەو پرسیاری گرنگی سەبارەت بەکۆمەڵگەی کوردی پێیە و بابەتی سەرسوڕهێن لەو بارەوە دەوروژێنێت. کە من قسەم لەگەڵ گۆراندا دەکرد، بەو بڕوایە گەیشتم کە ئەو دەبوو شۆفێر نەبوایە، بگرە دەبوو ببێت بە ڕۆژنامەوان. چونکە چاوێکی تیژی هەیە کە زۆر شتی ئەو کۆمەڵگەیە دەبینێت، بەتایبەتی ڕەوشی گەنجان. سەرباری چاوی تیژ هەستم کرد خەیاڵێکی فراوانیشی هەیە، ئەو کەرەستە گرنگ و کاریگەرەی کە لە کن زۆربەی ڕۆژنامەوانەکانی ئێمە نییە. گۆران دەبوو سەرپەرشتی جیهانی گەنجان لە یەکێک لە ناوەندەکانی میدیادا بکات.

گۆران بەتەنێ نییە کە ڕەوشی ژیانی ئەوەندە ناڵەبارە. بگرە ئەوە حاڵی گەنجە بەگشتی لە ئەمڕۆی کۆمەڵگەی ئێمەدا. کۆمەڵگەیەک کە ڕەوشی گەنجەکانی ئەمڕۆی ئەوەندە ناهەموار بێت، دەبێ سبەینێیەکی چەندە گەشی هەبێت؟ دیارە سبەینێی گەش و داهاتووی شیاوی گەنجان، واتا سبەینێ گەش و داهاتووی شیاو بۆ هەموو کۆمەڵگە.

گەنجان لە نیشتمان تۆراون و دەڕۆن... بۆ؟ گەنجی ئێمە پشت لە نیشتمان دەکات.

مانگی هەشتی ٢٠٠٧ لە وڵات، گەنجێک بەهاوڕێیەکم و بەمنی گوت: بیستوومە دەگەڕێنەوە بۆ کوردستان، گوتمان بەڵێ، گوتی کەسم

نەبینیوە ئەوەندە ڕقی لە خۆی بێت. دیارە ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نەبووین، بەڵام بۆچوونی لەم چەشنە تێڕامانی قووڵی دەوێ. لە هۆشیاری، لە کوردایەتی و نیشتمانپەروەریەتیی ئەو گەنجە دڵنیام، بەڵام بۆ بەم بڕوایە گەیشتووە؟ دەبێ ئێمە لەم پرسیارانە و لە پرسیارەکانی تری گەنجان ڕامێنین، دەبێ بیر لە ژیانی گەنجان بکەینەوە کە لەچ دژوارییەکدا دەژین دەبێ سەکۆمان هەبێت بۆ قسەکردن سەبارەت بەو بابەتانە. دەبێ میدیای ئازاد مان هەبێت. کەچی ئێمە دەمانەوێ میدیاکان دەمکوت بکەین. یان لە باشترین حاڵدا دەمانەوێ ڕێوشوێنی گونجاو* بۆ میدیاکان دەستنیشان بکەین تاکو لە "تەیری مەعقوول" بچن. دیارە دەشزانین کە دەستنیشانکردنی "ڕێوشوێنی گونجاو" بۆ میدیا لە کۆمەڵگەی نۆژەنی دیموکراتدا کاری نەکردەیە.

گەنجی ئێمە ناهەقی نییە لە نیشتمان تۆراوە. دەبێ نیشتمان باوەشێکی گەرم بێ بۆ داخوازییەکانی گەنج، کە زۆربەیان داخوازی ڕووحین، زۆربەیان هەست و هەناوی مرۆڤ ئاوەدان دەکەنەوە.

نیشتمانێک ئاوەدان و دڵگیرە کە هەست و هەناوی مرۆڤەکانی ئاوەدان بێت.

---

(*) ماوەیەک وەکو ڕاگەیاندنی حزبەکانیش بڵاویان دەکردەوە، دەسەڵاتدارانی کوردستان بە نیازی ئەوە بوون ڕێ و شوێنی گونجاو بۆ میدیای کوردی دابنێن.

## وردەكاری

ئێمە وێڵی دووی ڕاستین، بەڵام دەمانەوێ تەنیا ڕاستی لەو شوێنەدا بدۆزینەوە، کە خۆمان پێمان خۆشە.

ژنی ئازاد و نووسەری ئۆتریشی: ماری فۆن
ئێبنەر - ئێشەنباخ ١٣/٩/١٨٣٠-١٢/٣/١٩١٦

چەند ساڵێکە لە میدیای کوردیدا، بەتایبەتی لە ڕووبەری کاری ڕۆژنامەوانیدا ئەم ناونیشانە زۆر دەبیندرێت:

"وردەکاری سەردانەکەی...، وردەکاریی ڕوودانی...، وردەکاریی تەقینەوەکە... و تاد".

کاتێک لە دەستپێکدا من ئەم ناونیشانەم دەبینی دڵخۆش دەبووم کە ڕاگەیاندنی کوردی بۆ نووسینی هەواڵ و ئامادەکردنی ڕاپۆرت خۆی ماندوو دەکات و پەل بۆ چەندین سەرچاوەی گرنگ دەکوتێ تاکو ڕاستیی ڕووت بەخەڵک بگەیەنێت. بەڵام جارێک، دوو جار و چەندین جار کە وردەکاریم دەخوێندەوە و ئێستایش دەیخوێنمەوە تێ دەگەم کە ئەمانیش بەجۆرێک لە جۆرەکان خوێنەر دەخاپێنن و بەئاوایەک خۆڵ دەکەنە چاوی خوێنەرەوە.

دەمپرسی ئایا وردەکاری هەیە دوو ڕستە بێت؟ بەڵام لە بری وەڵام ئەمجارە چم دەبینی؟ "تەواوی وردەکاری..."م وەکو ناونیشان دەبینی کە نەک وردەکاری تەواو، بگرە "درشتکاری"یشی تێدا نابیندرێت.

ئەو ناونیشـانی "وردەکاری"یە، دەبێ "شـتی" بەدوادا بێت، پێویسـتە لە ژێر ئەو ناونـیشـانەوە کۆمـەڵێ زانیـاریی گرنگ هـەبن کە بەڕاسـتی وردەکاری بن و ڕووداوەکان "بـەزمانی ڕاگەیاندن" سـەرتاپا بخـاتە بەر دەست و هـەمــوو پەردەکــانمان بۆ هەڵبــداتەوە. بەڵام ئایا لە بن ئەو "وردەکـاری"یەدا چەند جاران ڕوونـکردنەوەی لەو چەشنـە هەبوون، من بەش بـەحـاڵی خـۆم ڕوونکـردنەوەی لەم جـۆرەم نەبینی کـە شـایانی ئەوەبن پێیان بگوترێ وردەکاری.

جـاری وەهـا هەیە هـەواڵێکی زۆر کـورت بڵاو کـراوەتەوە، کـە هـیچ وردەکـاریـی تێـدا نیـیـە، بەڵام لە کـۆتاییی هـەواڵـەکـەدا ئەم ڕسـتـەیە نووسراوە "لە داهاتوویەکی نزیکدا وردەکاریی زیاتر بڵاو دەکەینەوە"

"وردەکـاری" وەکو چەمـک و وەکو وشـە لە زۆربەی زمـانەکـاندا یەک تێگەی هەیە. بەزمانی میدیایش کە نووسـیمان و باسمان لە وردەکاری کرد، دەبێ "ورد – کـار" بێن هەمـوو سـەرەداوەکـان بدەین بەدەسـتـەوە. ئایا ئەو وردەکارییانەی ئێمە دیانخوێنینەوە گرێیەکانمان بۆ دەکەنەوە؟

ئایا بەڕاستی ئەوانە چەند هەوڵ و مـاندووبوونیان لە پشتـەوەیە تاکو پێیان بگوترێ: وردەکاری؟

وردەکـاری یەکـێکە لەو چەمکانەی زۆر بەهـەڵە لە مـیـدیای کـوردیدا بەکار دەهێندرێت.

یەکێک لە نەخۆشییەکانی میدیای کوردی ئەوەیە زۆر خراپ چەمک و زاراوە بەکار دەهێنێت. ئەم خراپ بەکارهێنانی وردەکـارییەیش هـەر لە بازنەی ئەو نەخۆشییەدایە.

جـێگەی داخـە تا ئێـسـتـا مـیـدیای کـوردی نـەک هەر نەیتـوانیـوە

وردەكـــاری ڕووداوەكـــان بەخـــوێنـەر بگـەیەنێت، بگرە هـەندێ جـــار بەشێوەیەكی سـەراویش ناتوانێت هەواڵەكان بەشێوەیەكی بە پاكی و بە پوختی بگەیەنێت.

ؤ لەم بوارەدا ڕەنگ بێ میدیای كوردی یەكێك بێت لەو میدیایانە كە لە بواری دەست و پێ سپیەتیدا پێشەنگن، یان لە پێشەنگەكانن.

مـیدیای كـوردی بەر لەوەی خـۆ باوێتـە دەریای وردەكـارییـەوە، بەر لەوەی لاسـاییی مــیـدیای دەوروبەر، بەتایبـەتیش مـیـدیای عــەرەبی بكاتەوە، دەبێ ڕۆژنامەوانەكانی فێری ئەوەی بكات چۆن زمانی كوردی بەكاربهێنن و چۆن بەو هەموو هەڵەی چاپە سەر لە خوێنەر نەشێوێنن.

دەزانم ئەم بـابەتە زۆر باس كـراوە، شـتـیش زۆر بـاس كـرا بـێ تام دەبێت، دووباره كــردنـەوەی شت نـرخ خــراپ دێنێــتــە خــوار، بەڵام بابەتـەكە لەوە گـرنگتـرە دەسـتـبـەرداری بـین. زۆر جـار بەهـۆی هـەڵەی چاپەوە، هـەواڵێک، نووسـینێک لە خـوێنەر دەبێت بەخـاچەپرس و دەبێ بە هەوڵێكی زۆر لێی حاڵی ببێت و بچێتەوە سەر مەبەستی نووسینەكە یان ئامانجی هەواڵەكە.

زۆر جــار لە مــیـدیای ئـێـمــەدا وشــەكـان بەجـۆرێک گـۆڕاون كـە نووسـەرەكە خۆی نەبێت، هیچ كەسێک، باوەڕ ناكەم هیچ كەسێک لێی تێ بگات، نازانم كەسێک (بەسیلەی ڕەحم) بتوانێت لە هەموو شتێكی ئاڵۆز تێ بگات.

ڕاستییەكەی میدیای كوردی بەر لەوەی خۆی بكات بەئامرازێک بۆ لاساییكردنەوەی میدیاكانی دی، دەبێ ڕەوشی خۆی بگۆڕێ. پێویستە بەر لە هەموو شت ئەوە بۆ خۆی دەستەبەر بكات كە شایانی ئەوە بێت وەكو میدیا تـەماشا بكرێت و هەواڵ و نووسینەكانی لە ئاستی دنیای

ئەوڕۆی مـیـدیادا بن. دەنا بەپێچەوانەوە خـۆ خـسـتنە ناو هەمـوو وردەکـارییـەکانەوە ناتوانێ خـەوشـەکان بشـارێتـەوە و لە ئـەنجامـدا هەردوو لا دەست بەتاڵانە لە کـارەکـە دەردەچن، هەردوو لا مـەبـەسـتم میدیا و خوێنەرەکانیەتی.

## لێک تێنەگەیشتن یان گوێز ژماردن

هێزگەلی هاوپەیمانان لەگەڵ ڕووخاندنی بەعس و تێکشکاندنی پەیکەری "فیردەوسەکەی سەدام"دا، "ئیمارەتی" تۆقێنەرانی ناوخۆیشیان لە هەورامان و شارەزوور تێک شکاندن. پاش ڕووخاندنی بەعس، گەرما و گەرم، پەیامنێری یەکێک لە تەلەفزیۆنەکانی کوردی دەچێتە ئەو دەوروبەرە و لە نزیک ئاواییی بیارە پیرەمێردێک دەبینێت. پەیامنێری تاین یەکسەر و بێ پێشەکی ڕووبەڕووی ئەو پیرەمێردە دەبێتەوە و بەپرسیارێکی درێژ وڕی دەکات و چاوەڕێی وەڵامیشە لێی.

ئەمە پرسیاری پەیامنێرەکەیە:

خاڵە گیان، دوای ئەوەی بەگورزی مووشەکی تۆماهۆک و کرۆزی هاوپەیمان، ناوچەی هەورامان و شارەزووریش پاک کرایەوە، پاش بۆمباباران بە مووشەکی ژیر و بۆمبای هێشوویی، دوای ئەوەی پرۆسەی ئازادی، ئۆپراسیۆنی هاوبەشی کورد و هاوپەیمانان، شەڕی دژە تیرۆر و بەربەریستان، لە هەناوی خۆیدا ئازادی بۆ ئەم دەڤەرەیش هێنا، پاش ئەوەی ئەم دەڤەرەیش ئاوێتەی پرۆسەی دیموکراسی و پرۆسەی فیدرالی و پەرلەمانی دەبێتەوە، دەتوانی قسە بۆ مایکی تیڤی ئێمە بکەیت و هەستی خۆت دەربڕی.

بەڵێ، نیشتمانی دوای مووشەکباران، نیشتمانی دوای تیرۆریستان بۆ ئێوە چییە؟

پیرەمێردەکە وا حاڵی دەبێ کە ئەمە مەتەڵە و دەبێ هەڵی بێنێ. دیارە بەشێوەزاری شیرینی هەورامی لە بەرگی پرسیاردا وەڵام دەداتەوە و دەڵێ: گوێزە؟

ئەمە لێک تێنەگەیشتنێکی بەئازارە نەک مایەی پێکەنین. ئەمە ڕەوشێکە میدیای کوردی تێیدا دەژی و ناشزانێ کە تێیدا دەژی.

میدیای کوردی لە پاڵ گەلێ پرسیاری دیکەدا دەبێت ئەم پرسیارگەلەیش لە خۆی بکات: ئایا تا چەند ڕوون و بێ گرێم و تا چەند لێم حاڵی دەبن؟

ئایا تا چەند پەیامی مەبەستم گەیاندووە و دەیگەیەنم بە گوێگران و خوێنەران و بینەران؟. بەڵام ئایا میدیای کوردی پرسیار دەکات؟ ئایا میدیای کوردی خوڵقێنەری پرسیارە؟

ئایا میدیای کوردی گرینگی داوە بەورووژاندنی پرسیار و کەسی لەسەر پرسیار و پرسیارکردن ڕاهێناوە؟

دەردی بکوژی میدیایەک ئەوەیە پرسیار نەخوڵقێنێت، میدیایەک هەمیشە زەمینەی گوێڕایەڵی خۆش بکات، میدیا نییە و خۆی پێی وایە کاری میدیا دەکات. هیچ میدیایەک ناتوانێت ببێتە دڵی گۆڕانکاری ئەگەر خەڵکەکەی حاڵی نەکات و خەڵک لێی تێ نەگەن.

میدیایەک نەبێتە مەکۆی پرسیار و نەبێت بەتۆڕی زانیاریدان ئەو میدیایە مایە پووچە. میدیای لەو چەشنە، میدیایەکە وەک ستوونی هەناو بۆش، چی لەسەر هەڵبچندرێت و چی لەسەر دروست بکرێت هەرەس دێنێت.

ئایا میدیای ئێمە تا ئەم ساتەی قسەی لەبارەوە دەکەین، میدیایەک

نییە لەو شێوەیە؟ ئایا ژمارەی ئەو گوێگر و خوێنەر و بینەرانە چەندن کە میدیای کوردی سەرچاوەی سەرەکی زانیارییانە؟ ئایا ژمارەی ئەو کەسانە چەندن کە متمانەیان بەمیدیای کوردی هەیە؟ بۆ میدیای کوردی ئەم پرسیارانە ئاراستەی خۆی ناکات؟

پرسیارگەلێک ڕاستەوخۆ پێوەندییان بەبوون و ژیانی خۆیەوە هەن.

سەرباری لێک نەگەیشتن و لێک حاڵی نەبوون، میدیای کوردی میدیایەکە داهێنەری! شێوازی سەیر و سەمەرەی دروستکردنی هەواڵ، داڕشتن بەزمانێکی ناجۆر و ڕستەسازییەک کە زۆر نامۆیە بەسروشتی زمانی کوردی.

زۆر جاران لەگەڵ کەسانی دیکەدا بەرانبەر بەکەناڵی کوردی دانیشتووم و پاش تەواوبوونی هەواڵێک، پاش گوێگرتن لە داڕشتنێک، ڕستەیەک لە کەس، کەسانی دەوروبەرم پرسیوە، ئەرێ تێگەیشتی، تێگەیشتن؟ گوتوویە،گوتوویانە: وام زانی، وامان زانی گوێزمان بۆ دەژمێرێت. ئایا میدیای کوردی دەیەوێت هەتا کەی لە ژماردنی گوێز بەردەوام بێت؟

## سیاسەتوانی خاوەن ئەزموون و لێهاتوو

سێ ڕۆژنامە لە سەد ڕم زۆرتر من دەترسێنن

قەیسەری فەرەنسی: ناپلیۆن بۆناپارت

پێوەندی لەگەڵ ڕۆژنامەوان وەکو پێوەندییە لەگەڵ تیمساحدا، مرۆڤ ناچار نییە خۆشی بوێن، بەڵام ناچارە دانیان بدات.

ویلیام پێری سیاسەتوانی ئەمەریکی و وەزیری پێشووتری بەرگری

یەکێک لەو شتە ناجۆرانەی هەرگیز میدیا نابێت خۆی لە قەرە بدات ناو و نازناو دابەشینە. لە دەربڕینی ناوی کەسەکاندا، دەبێ بەڕوونی دان بەناو و پۆستەکانیان دابنێت یان بینووسێت.

نابێ کەم و زۆر لە بواری ناو و کاردا سەربەخۆ و بێ لایەن نەوەستێت.

سیاسەتوانی خاوەن ئەزموون و لێهاتوو

سەرکردەی ژیر و ڕابەری کوردایەتی

دیبلۆماتی ژمارە یەکی نەتەوە

ئەمانە ڕستەگەلێکن دەبێ لە بواری ڕۆژنامەوانیدا بەرچاو نەکەون، کەچی لە بواری ڕۆژنامەوانی کوردیدا ئەوەندە زۆرن، ئەوەندە

دەگوترێنەوە کە ئیدی بووە بە بەو هەڵدێرەی هەیە و دەبێ بەسەریدا دەرباز بیت.

نەک هەر ئەوەندە ڕستە، بگرە کۆمەڵێ شتی دیکە نامەوێ سیاسەتوانێک یان سەرکردەیەکی پێ بناسرێنەوە، نایاننووسم، چونکە دیاردەکە گرینگە، قسەکردن و چارەسەرکردنی دیاردەکە پێویستە، نەک قسە لەسەر کەسانێک کە هەم دەبێت بەمایەی ورووژاندنی بێ ئەنجام و خراپ، هەمیش ورووژاندنەکە بەئاراستەیەکی دیکەماندا دەبات و چارەسەری کێشەکە لەبیر دەکرێت.

میدیای کوردی لەوە بەرپرس نییە کە فلان میوان، دیداروان یان هەر کەسێک خۆی چۆن دەناسێنێت، بە دکتۆر، ئەندازیار یان پارێزەر، دیارە لە میدیای مۆدێرنی ڕۆژئاوادا ئەم دیاردەیە زۆر کەمە، ئەو کەسانەیشی ئەم نازناوانە لە پێش یان لە دوای ناوەکانیان دەنووسن بەژمارە زۆر کەمن. بەلام ئەگەر بیشینووسن مافی خۆیانە و هیچ زیانێکی نییە.

بەلام ئەوەی میدیا نایێت بیکات دابەشینی ئەو نازناوانەی سەرەوەیە. کە ئەو نازناوانە لە هەواڵ، لە ڕاپۆرتە هەواڵ، نووسین و شرۆڤەی ڕۆژنامەوانیدا هەبوون، ئیدی ناسنامەی کاری ڕاگەیاندن ئاشکرا دەبێت، ئاشکرا دەبێت ئەو ڕاگەیاندنە چییە و چ نرخ و بەهایەکی بۆ کاری پیشەییی ڕاگەیاندن پێیە. ئەگەر ڕوونتر قسە بکەین، دەبێ بڵێین:

تۆ کە ڕاپۆرتە هەواڵێک، شرۆڤەیەکت بەم ڕستەیە "سیاسەتمەداری خاوەن ئەزموون و لێهاتوو" دەست پێ کرد، ئیدی دەستەکەت دەکەوێتە

ڕووە. ئیتر تۆ ڕاگەیاندنی "بێ لایەن یان سەربەخۆ" نیت، ئاشکرابوونی ئەمەیش واتا مەرگی ڕاگەیاندنی خاوەن سەربەخۆیی. ئەو مەرگەیش لەو گەمەیەوە سەرچاوە دەگرێت کە سالآنێکی زۆرە لە نێوان دەسەلآتدارانی ئەو ولآتەی ئێمەدا بەردەوامە.

لە هەموو کۆکی و ناکۆکیی "سیاسەتمدارگەلی خاوەن ئەزموون و لێهاتوو"ی ولآتی ئێمەدا ڕۆژنامەوانان لە ڕیزی یەکەمی قوربانییەکاندان. ئەمان وەکو جەستە نابن بەقوربانی، بەلآم بەردەوام وەکو مۆراڵ، ڕوح و متمانە دەبن بەقوربانی. نەک هەر کەسانێکی زۆر هەن وەکو تاک لە سالآنی ڕابردووی ئێمەدا بوون بەقوربانیی ئەو "کۆکی و ناکۆکییە"، بگرە سەرجەم بزاڤی ڕاگەیاندنی ئێمە کە تا ئێستا نەیتوانیوە ببێت بەهەڵگری ناسنامە و کەسایەتیی خۆی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نەخۆشییە کوشندەیە.

ڕۆژنامەوانیی ئێمە متمانەی بزر کردووە؛ متمانەیەک نە ئەو بەکەسی دیکەی هەیە. نەوەرگریش بەکارەکانی وی. ڕاگەیاندنێکە لە هەناوی ئەو سیاسەتەوە هاتووەتە دەرێ کە زۆربەمان مێژووەکەی دەزانین، مێژوویەک پڕاوپڕ لە بێ متمانەیی بەیەکتر. مێژوویەک پڕاوپڕ لە شەڕ، ئاشتبوونەوە و دیسان شەڕ. سیخناخ بە کۆکیی درۆ و ناکۆکیی ڕاستەقینە.

میدیا نەک دەبێت ئەو ناو و نازناوانە نەبەخشێتەوە، بگرە دەبێ بەکاری پیشەیی خۆی ببێت بەخودان هەیبەتێک خوێنەر بڕوای پێ بکات، بڕوا بەواتا فراوانەکەی. هەیبەتێکیش کە سیاسەتوانی کۆن و نوێی وەکو پۆناپارت و ویلیام پێری بیری لێ بکەنەوە و لە ڕم زۆرتر حیسێبی بۆ بکەن. چونکە ڕمی میدیا ڕمێک نییە سەربازەکان

بپێکێت، ئاخر سەرکردە ناچێتە بازنەیەکەوە ڕم بیگرێتەوە. ئەوە تەنیا ڕمی میدیایە دەتوانێ زۆر بەوردی سەرکردە و سیاسەتوان بپێکێ. پێکانێک خوێن بەجەستەیەوە دیار نییە، بەڵام ناچاری گۆڕانکاری یان مەیدان چۆڵکردنی دەکات.

# ویلبوون

## که ڕاگەیاندن سەری لێ تێک دەچێ

که ئاوی، ئاوی گەوهەر بە، وەگەر نە، بلقی سەرئاوی

نالی

لە تورکیا چ ڕوو دەدات؟ کەس ئاگای لێیە؟ ئایا ئەوە ئەرکی میدیا نییە ڕووداوی گرنگی دەوروبەر ڕووپێو بکات و بەخوێنەر و خەڵکی بگەیەنێت؟

لە مانگی ڕابردوودا تورکیا دوو ڕووداوی گرنگی بەخۆوە بینی. یەکەمیان:

ڕۆژنامەی یەنی شەفەق، ڕۆژی ٢٠٠٨/١/٢٥ هەواڵی کوشتنی نووسەر ئۆرهان پاموکی بڵاو کردەوە.

دیارە هەواڵەکە بەوردەکارییەوە بڵاو کراوەتەوە. ڕۆژی دواتر ٢٠٠٨/١/٢٦ ڕۆژنامەی میللەت هەمان هەواڵی بڵاو کردووەتەوە و ئاماژەی بەهەواڵ و مانشێتەکەی ڕۆژنامەی یەنی شەفەقیش کردووە. چونکە هەڵگری خەڵاتی ئەدەبیاتی نۆبڵ لە لای گەلی تورک و سیاسەتمەدارانی کەمالیزم لەبەردڵان نییە، بۆیە هەواڵی کوشتنەکەی ڕۆژەڤ داناگیرسێنێت و ناوەندی دەسەڵاتدار، دیارە دەسەڵاتدارانی کەمالیزم، ناهێڵن گرنگی بەهەواڵی وەها بدرێت. ئەو ناوەندی

دەسـەڵاتە لە تورکیـا لەبەر زۆر هۆ، کـە باسکردنیـان لێـرەدا ئێمـە لە مـەبەسـتی نووسـینەکـەمـان دوور دەخـاتـەوە، ڕێگە لە بڵاوکـردنەوەی بابەتی وەها دەگرن.

دووەمیان: نەخۆشییە درێژخایەنەکەی تورکیا، مەسەلەی لەچکە.

پاش هەوڵدانێکی زۆری هەردوو لا، ئیسلامییەکان و کەمالیستەکان، پەرلەمـانی تورکـیا ڕۆژی ٢٠٠٨/٢/٨ پاش سـیـازدە سـەعـات بگرە و بەردە، بەزۆرینەی دەنگ (٤١١ بەڵێ، بەرانبەر بـە ١٠٣ نەخێر) یاسـای قەدەغەکردنـی لەچکیـان هەڵگرت. ئێسـتا ئـەو یاسایە بەرەو "چانکایا" کۆشکی سـەرۆکایەتیی کـۆمار بەڕێوەیە و ڕەزامـەندی سـەرۆک کـۆماری دەوێت، دیارە سـەرۆک کـۆماریش "ع. گوڵ"ە و بڕیارەکـە واژۆ دەکات. بەڵام پێشـتر، ڕۆژی ٢٠٠٨/١/٣٠ سوپاسالاری تورک یەشار بـیوکانت لـەو بارەیـەوە گـوتی: «هـەمـــووان بۆچوونی ئـێـــمـــە لە بـارەی لەچـک پۆشینەوە دەزانن». قسـەکەی دیار بوو ‌چ مـەبەسـتێکی لە خـۆ گرتووە و ئاشـکرایش بوو هەڕەشە لە کێ دەکات.

تا ئێـسـتـا لـەشکر خـاوەن دوا قـسـە و دوابڕیارە لـە تورکـیـا، بەڵام ئەمجارە هەمووان لە چاوەڕوانیدان شتێکی نوێ ڕووبدات. بەهەر حاڵ کــەس ناتوانـێ پێـشــبـینی بکات چۆن دەبێت ئەگــەر دیموکــراسی ســەردەست و بنچـینـەی بڕیار بێت، دیارە ئـیسـلامـیـیـەکـان زۆرینەی دەسـەڵات پێک دەهێنن. ئەگەر ئەمجارەیش لەشکر، وەکو هەمیشـە، پێی هەرس نەکرێت ئەوا هەمووان دەبن بەبینەری پێشـهاتێکی گرنگ.

بەهـەرحـاڵ گـرنگیی ئەم دوو بـابەتە بەجـۆرێکە، نـەک هـەر مـیـدیای تورکیا، بگرە میدیای هـەمـوو ئەو وڵاتانەی بەخۆوە سەرقاڵ کـردووە کە بەردەوام مەبەستیانە ئاگاداری پێشهاتەکانی تورکیا بن.

بەرانبەر بەم ڕووداوانە، ڕاگەیاندنی ئێمە سەرقاڵی چییە؟

ڕۆژنامەوانی ئێمە لە بری ئەوەی تیشک بخاتە سەر ئەو ڕووداوانە، لە بری ئەوەی بەو هێزە گەورەیەی ڕاگەیاندن کە بەدەستیەوەیە خەڵک ئاراستە بکات، لە بری ئەوەی گەمارۆی قەندیل و گەمارۆی مادەی ١٤٠ و گەمارۆی کارەبا، ئاو، هەموو گەمارۆکانی دیکە. بەهۆکار و زەخیرەی ڕاگەیاندن بشکێنێت.

لەبری ئەوەی خەونی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و سیاسی هەبێت، کەچی ڕێگەی خۆی وێڵ دەکات، ڕۆژنامەوان خۆی، بەهزری خۆی، ڕێگەی خۆی وێڵ دەکات و ملی ڕێ بەرەو قەندیل دەگرێتە بەر. هەر خۆی سەر لە خۆی تێک دەدات.

ڕۆژنامەوان کارەکەی خۆی کە پەیداکردنی زانیارییە و بەخشینیەتی بەخەڵک، فەرامۆش دەکات ئەرکی سەرەکی خۆی بەجێ دەهێڵێت و دەچێت گەمارۆی سەر قەندیل دەشکێنێت و ناویشی دەبات "ئاکتسیۆن" یان نازانم چەندین ناوی "سەرنجڕانەکێش"ی دیکە.

دیارە ئەوەی تورکیا بەهزری ملهوڕانەی دەیکات گومانی ئەوە ناهێڵێت کە هۆشێکی چەندە کێوی ئەو سوپایە دەجووڵێنێت و فەرمانی پێ دەدات. بەڵام ئێمە لێرەدا باس لە ئەرکی میدیا وەکو پیشە دەکەین. دەبوو "ڕاگەیاندنی" کوردی پەیامنێریان بناردبایە و ڕاستییەکانی قەندیل و هێرشی لەشکری تورکیان بگواستایەتەوە. نەک خۆیان بچن و تووشی شەری پۆلیس و پێشمەرگەی هەرێم ببن، ئەو پۆلیس و پێشمەرگانەی کە چەند مانگێکە مووچەیان وەرنەگرتووە. ڕاگەیاندن نابێت خۆی بئاڵێنێت بەم جۆرە شێوازانەوە. ڕاگەیاندن دەبێ کاری پیشەیی خۆی پیادە بکات، ئەوەی ئەو ڕۆژنامەوانانە

ئێستا لە بناری قەندیل پێوەی سەرقاڵن، کاری میدیا نییە.

ئایا ئەم ڕۆژنامەوانە بۆ وا دەکات؟

چونکە ئەویش وەکو خەڵک و خوێنەر باوەڕی بەکاری ڕاگەیاندن نییە "باوەڕی پێ نەماوە"؟

بەڵام شتێک ئەو لە خوێنەر جودا دەکاتەوە، شتێک بەگوێی هەست و تێگەیشتندا دەچرپێنێ:

کارەسات ئەوەیە کەسێک باوەڕی بەکاری خۆی نەبێت، یان ئەگەر باوەڕیشی پێ بێت نەزانێ چۆنی بەکار بهێنێت.

لەو وڵاتەی ئێمە زۆر کەمن ئەوانەی کاری خۆیان خۆش بوێت.

زۆر کەمن ئەوانەی گرنگیی کاری خۆیان بزانن و بتوانن لە هەلومەرجی گونجاودا دەست بەباڵی کارەکەی خۆیانەوە بگرن.

ئەم "ئاکتسیۆنە"ی ڕۆژنامەوانان بەئێمە دەڵێ: کاری ڕاگەیاندن لەلای ئێمە نەک هەر لە کن دەسەڵاتدار، سیاسی و بگرە لە لای زۆربەی ڕۆژنامەوانانیش نەبووە بەکارێک شایانی ڕێز و گرنگی بێت. دەنا هیچ ڕۆژنامەوانێک ئەوە ناکات، ئەوەی ئێستا لە بناری قەندیل ڕۆژنامەوانان دەیکەن.

ڕۆژنامەوان دەبێ ڕۆژنامەوان بێت، نەک شتێکی دیکە، هەر پیشەیەک لە سروشتی خۆی دابڕا و شتی دیکەی لەسەر بار کرا پووچ و بێ کرۆک دەبێت.

# نەكارابوون

## كاتێک میدیا خۆی لە دنیا بێ خەبەر بێت

ئەگـــەر ئازادی واتایەكی هـەیە، كـەواتـە ڕەوایە، بەخـــەڵک بگوترێت، ناتانەوێ گوهداری چی بكەن.

نووسەر و ڕۆژنامەوانی بریتانی جۆرج ئۆروێل

١٩٠٣/٥/٢٥ - ١٩٥٠/١/٢١

مـایەی ئازارە تا ئێسـتـا مـیدیای كوردی نەیـتوانیـوە وێنەیەكی ڕوونی سیاسی و كۆمەڵایەتیی توركیا بەخەڵک ببەخشێت. نەک هەر لە بواری ناسـینی توركـیـادا دەست و پێ سـپـیـیە، بگرە لە زۆر بواری دیشـدا میدیای ئێمە نانخۆر و جێگرە و هیچ ئەركێكی پێویست ڕاناپەڕێنێت.

پێش نیـــوەڕۆی ٢٠٠٦/٢/٢٥ ڕەجـــەب تـەیب ئەردۆگـــان ســـەرۆک وەزیرانی توركیا لە كاتێكدا بۆ ئەندامانی پەرلەمانی پارتەكەی وتاری پێشكەش دەكـرد، باسـەكـەی هێنایە سـەر لەشكركـێشـی توركـیـا بۆ باشووری كوردسـتان. ئەو دوعای خێری بۆ سەربازەكانی توركیا كرد كە لە پێناوی (وەتەنـدا) شەڕ دەكەن و سـەرباری مەترسی، ڕووبەڕووی سـەرما، بەفـر و بارانێكی دژوار دەبنەوە. بەڵام كـەس نەیپرسی: بەڕێز ئەو سەربازانەی توركیا بۆ لەوێن؟

سـەبارەت بەڕەوشـەكوژی و جینۆسـایدی گەلانیش كـە توركـەكـان لە مـێژووی خـۆیاندا دژی ئەرمـەن و كـورد ئـەنجـامـیـان داوە، ئەردۆگـان

گوتی: لە کارەکتەری میللەتی ئێمەدا ڕەشەکوژی نییە. لە نرخەکانی میللەتی ئێمەدا ڕەشەکوژی جێگەیەکی نییە.

لەمانە هەموو سەیرتر و ناسازتر ئەوە بوو، پاشتر لە کۆتایی قسەکانیدا ئەردۆگان شیعرێکی بۆ مەمەد چیک* کەکان خوێندەوە، ئەو سەربازانەی ئەوان لە پای داگیرکاری و وێرانکردنی پردە زۆر سەرەتاییەکانی کوردستان ڕەوانەی شەڕیان کردوون.

شیعرەکە هی مەمەد ئاکیف ئەرسۆیە** شاعیری نەتەوە پەرستی تورک.

بەشێک لە شیعرەکە:

مەمەدی من بەخۆشەویستییەوە سەرت بڵند بکە.
گەر بەمردوویش بێت خۆشحاڵانە بگەڕێوە ماڵ.
وا مەزانە ئەم هەورازە سەختە هەر دێتە ڕێت.
هەڵبەتە سبەینێ هی ئێمەیە"

میدیای کوردی، هەموو جار، لە هەموو ڕووداوە گرنگەکاندا، دەیسەلمێنێت چەند ناکارا و چەند ناکارامەیە، هەموو جار دەیسەلمێنێت شوێنێکی داگیرکردووە شوێنی ئەو نییە.

میدیای ئێمە لە کوێیە؟ پێیەکانی بۆ ئەوەندە کورتن ناتوانێت پێیان بگاتە جێی گرینگ و مەبەست؟

---

* مەمەد چیک ناوێکە تورکەکان بۆ خۆشەویستی بەسەربازی خۆیانی دەڵێن. شتێکە لە جۆری ئەبو خەلیلی عێراق.

** مەمەد ئاکیف ئەرسۆی ١٨٧٣-١٩٣٦ سروودی نەتەوەیی تورک و مارشی ئازادیی تورکیا لە نووسینی ئەو پیاوەیە.

پێیەکانی ئەو میدیایە ئەوەندە کورتن بەحاڵ دەگاتە شوێنی ئەو ڕووداوانەیش کە لە نووسینگەی بەرپرسەکانی کوردستان ڕوو دەدەن.

جێگەی داخە ئەو دامەزراوانەی ئەمڕۆ لە وڵاتی ئێمەدا ناوی ڕاگەیاندن و میدیایان لە خۆیان ناوە. ئایا میدیتی ئێمە لەوە ئاگادار لە تورکیا و لە ڕاگەیاندنی تورکیادا سەبارەت بەشەڕ چ دەنووسرێت؟

ئایا لەو ڕۆژەوەی شەڕ دەستی پێ کردووە، چەند هەواڵ و شرۆڤەی گرنگی میدیای تورکییان گواستووەتەوە؟

ئایا کەس هەیە لە میدیای کوردیدا کار بکات و ڕۆژانە چاودێری ماڵپەڕەکانی تورکیا بکات؟ ئایا کەس هەیە ڕۆژانە تەماشای ماڵپەڕی Genelkurmay baskanligi * بکات؟

باشە بۆ ئێمە لەم تەنگژە و پێشهاتانەدا ڕۆژنامەوانێک، لێکۆڵەوەیەکی ڕاگەیاندن و شرۆڤەکارێک شک نابەین سەبارەت بەو ڕووداوانە زانیاریمان پێ ببەخشێت؟

ئەوانەی پێیان وایە شتێک بەناوی میدیای کوردییەوە هەیە، کەی دەتوانن وا بکەن لە ڕەوشە دژوار و ئاڵۆزەکاندا میدیایەکی ئامادە هەبێت و وەکو ئەمڕۆیان بەسەر نەیەت؟

ئایا کە میدیا خۆی لە دنیا بێ خەبەر بێت، دەکرێ چ دڵێکی پێ خۆش بکرێت و چۆن چاوەڕوانی بین زانیاری دروستمان لە کاتی خۆیدا پێ بگەیەنێت؟

---

* سەرۆکایەتی گشتی لەشکری تورک.

## ئەركی سەرەكیی ئەم قۆناغەی ڕۆژنامەوان

مرۆڤ ناچارە چەشنی هێلكەی شڵەقێندراو هەڵسوكەوت لە تەک هەندێک سیاسەتواندا بكات، مرۆڤ چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ هێلكەی شڵەقێندراودا دەكات؟ دەیڕێژێتە ناو تاوەوە.

دیتەر هالەرفۆردەن - ١٩٣٥ بەزمساز*، بێژەر، شانۆكار و گۆرانیبێژی ئاڵمان

چەن سەختە ئەركی سەرەكی بۆ ڕۆژنامەوان دیاری بكرێت. ڕۆژنامەوان یەک ئەركی هەیە و میدیایش یەک پەیام. ئەویش: گوتنی ڕاستی، نووسینی ڕاستی، ئاشكراكردنی ڕاستی، ڕاگەیاندن و بڵاوكردنەوەی ڕاستییە.

ئەمە ئەركی ڕۆژنامەوان و ئەو دەزگا زانیاری بەخشەیە لە هەموو قۆناغەكاندا. ئەوە تەنیا سیاسەتوانە، سیاسەتوانێک كە لە هێلكەی شڵەقاو دەچێت پێی وایە ڕۆژنامەوان بەپێی قۆناغەكان دەبێ ئەرک و كاری خۆی بگۆڕێت.

باوەڕی ئەو پیاوگەلە وەهایە و گەرەكیانە ڕۆژنامەوانیش لە سێبەری كەشی وەرزەكاندا قسە بكات. پیاوگەلێک مەبەستیانە ڕۆژنامەوان ڕووی دیاردە و ڕووداوەكان بداتە بەر تیشكێک كە نسێیەكانی ژیانی خۆیان و دەوروبەرەكەیان ناگرێتەوە. تیشكێک تا پەرژینەكانی ئەوان

---

* كۆمیكەر، كۆمیدیسیەن، شانۆكاریی بەزمساز.

بڕ بکات. تیشکێک، هەر بەر پەرژینەکانی ئەوان کەوت لە وزەی بینین بکەوێت و ڕووناکی لە خۆیدا کوێر بکات.

بەسیاسەتوان بێت شووشەی ڕۆژنامەوان بەردەوام ڕەنگی شلەی ئەو پلانە بگرێت کە خۆی مەبەستیەتی و حەز دەکات ڕۆژەڤ بتەنێ.

ساڵانێکی زۆرە بەردەوام لە کۆمەڵێ پەنجەرەی بەربڵاوەوە، لە ڕووبەری کۆمەڵێ ڕۆژنامەی ڕۆژانە، هەفتانە و کۆوارەوە ئەم ڕستەیە: (ئەرکی سەرەکیی ئەم قۆناغەی ڕۆژنامەوان.) دەنووسرێتەوە. دیارە لەژێر ئەو ڕستەیەدا وتارگەلی سارد و سڕی بێ ناوەڕۆک، بێ کرۆک دەنووسرێن. وتارگەلێک بەیەک بیر بەرهەم دێن، کۆمەڵێ دەربڕین یەک چاوگی هاوبەشیان هەس، بەڵام بەردەوام و لە قۆناغە جیاوازەکاندا دەیدەنەوە بەگوێی ڕۆژنامەواندا، یان ڕاستتر فەرمانێکە و ئاراستەی ڕۆژنامەوان دەکرێت تاکو ئەرکی خۆی باش بزانێت و ئەو فەرمانەی پێی دەکرێت باشی ڕاپەڕێنێت.

ئەو سیاسەتوانانەی خۆیان لە هەموو قۆناغەکانی کاری سیاسییاندا سەرکەوتوو نەبوون، کەچی دێن و ئەرکی هەموو قۆناغەکانی ڕۆژنامەوان دەستنیشان دەکەن.

بێ بەختی نیشتمان و نەتەوەیەک لێرەوە دەست پێ دەکات. نەتەوەیەک بەشایانی ئەوە نەزانرێت ڕاگەیاندنی سەربەخۆی هەبێت.

کێیش ئەو شایستەبوونە بەڕەوا نەبینێت؟ پیاوگەلێک کە سەرجەم بوارەکانی کاری سیاسەتیان بۆ خۆیان پاوان کردووە.

سیاسەتوانی ئێمە ساڵانێکە کار بۆ ئەوە دەکات پیشەی ڕۆژنامەوانی سووک بکات و کاری میدیایش بکات بەکارگەی

بەرهەمـهێنانی ناڕاستگۆیی و بێ متمـانەیی. تا ڕادەیەکی زۆریش لەو کارەیاندا سەرکەوتوو بوون.

ئەوان وایان کـردووە لە وڵاتی ئێـمـەدا کـاری ڕۆژنامـەوانی ڕەنگ و ڕووی شایانی خۆی لە دەست بدات.

ڕاغیب دوران ڕۆژنامەوانی دیموکراتی تورک و سالانێک پەیامنێری ب.ب.سی، لە سیـمـینارێکدا سـەبارەت بە «بێ ئەرزشـبوونی» ئەمڕۆی ڕۆژنامەوان دەیگوت:

سـالانی زوو لە شـەقـامی ئیـسـتیـقـلالی گەڕەکی بەیئۆغلوی شـاری ئەسـتـەمـبـوڵ کـە ڕۆژنامـەوانێک دەردەکـەوت، خـەڵکی شـەقـامـەکـە بەڕێزێکی زۆرەوە تەماشـایان دەکرد و بەنیگا ڕێزی خۆیان پێشکەش دەکـرد، بەڵام لە ڕۆژی ئەمـڕۆمـانـدا هەر لە هەمـان شـوێن کـە ڕۆژنامـەوانێک دەردەکـەوێت و خـۆی بەقـاوەخـانەیەکـدا دەکـات، لە ژوورەوە پیاوێک بەهاوڕێیەکەی دەڵێت:

تەماشا ئەو سەرسەرییەیش ڕۆژنامەوانە.

دیارە هۆکار کێیە ڕۆژنامـەوان وای بەسـەر دێت و ئەو ڕەنگ و ڕووە شایانە بزر دەکات؟

دەسەڵاتی گەندەڵ و ڕەگەزپەرستیی تورکیا پێویستی بەڕۆژنامەوانی سەرسەرییە، ڕۆژنامەوانێک دەسەڵات چ فەرمانێکی پێ کرد بێ سێ و دوو ڕایپەڕێنێت.

هەر دەسـەڵاتێک، سـەربە هـەر نەتەوە، کـولتـوور و زمـانێک بێت کـە ڕۆژنامەوانی لەمجۆرەی بەرهەم هێنا، داهاتووی نییە.

هەر دەسـەڵاتێک، قـسـەکـەر و بەردەڤکەکـانی ئەو فـەرمـانبـەرە

گوێڕایەڵانە بن سەرجەم کۆمەڵگە لە حاڵێکی ترسناکدا گیرۆدە دەکەن.

کۆمەڵگەیەک بەخۆی و سەرجەم بوارەکانی ژیانەوە دەچەقێت، ئەو کاتەی پیاوگەلی سیاسی ڕۆژنامەوانان لە پای بەجێهێنانی ئەرکی سەرەکیی قۆناغەکاندا ئاراستە بکەن.

کارەساتە سیاسەتوانی ئێمە تا ئێستا پەی بەوە نابات کە ئەوە تەنیا میدیای سەربەخۆ و ڕۆژنامەوانی بوێرە دەتوانێ ڕووی کۆمەڵگە بەرەو شارێی یەکسانی و وەکهەڤی وەرگێڕێت.

سیاسەتوانی ئێمە، سەرباری ئەوەی خۆیان خاوەنی هەموو "دەنگە دلێرەکانی" ڕاگەیاندنی کوردین، سەرباری هەبوونی ڕۆژنامەی ڕۆژانە، گۆواری زۆر، تەلەفزیۆنی یەک لە دووی یەک، کەچی لە نووزەیەک دەسڵەمێنەوە، نووزەیەک لە گەروویەکی جیاوازەوە بێت. بەتیشک ێک شەوارە دەبن، تیشکێک لە ئاسمانی بیرکردنەوەی خۆیانەوە دەرنەکەوێت.

چاوبرسی ئەوەیە دەیان کەناڵی ڕاگەیاندن بەقووتی خەڵک ساز بکات و بەڕێوەی ببات، کەچی باڵندەی ڕەنگێکیش لەگەڵ پۆلی ئەودا نەفڕێ، بەردەوام هەوڵی خستنە خوارەوەی بدات.

ئەرکی سەرەکیی ئەم قۆناغە و هەموو قۆناغەکانی داهاتوویشمان ئەوەیە کە:

ڕاگەیاندنێکمان هەبێت لە ڕاگەیاندنی ڕۆژ و لە میدیای جیهانی دیموکرات بچێت.

ڕاگەیاندنێک یەک پەیام بەئەرکی بەردەوامی خۆی بزانێت: ڕاستی. گوتنی ڕاستی، نووسینی ڕاستی، ئاشکراکردنی ڕاستی، ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەی ڕاستی.

## نیشتمانی بۆ میدیا

مرۆڤ پێویسته ساده قسه بکات، بەڵام ئاڵۆز بیر بکاتەوه، نەک بەپێچەوانەوه.

سیاسەتوانی ئەڵمان فرانس یۆزیف شتراوس

١٩١٥ – ١٩٨٨

با چاوێک بەمیدیای تورکیادا بخشێنین و پاشان بپرسین بۆ دەسەڵاتدارانی ئێمه بەردەوام شتمان لێ دەشارنەوه. بۆچ تەنیا که ڕەوشەکه دەگاته شوێنه ناسکەکان ئەوجا مەترسییەکه بەخەڵک دەڵێن؟

بۆچ تەنیا له دەمی پچڕانی پەتەکەدا دەنگیان بەگوێی خەڵک دەگات؟

هاوپەیمانیەتیی! کورد و ئەمریکا چۆنه؟ دەبێت بۆ باسی نەکەن؟ بۆ چەندین مانگ مووچەی پێشمەرگه دوا دەکەوێت؟

ئایا دەبێ چاوەڕوانی پێشمەرگەی برسی و ڕووت بکرێت تاکو دەسەڵاتداری تێر و پۆشته بپارێزێت؟ بۆ ڕوون نین لەم باسانه و له سەرجەم باسەکانی دیکەیاندا؟

بۆ هەڵوێستی پارتی و یەکێتی لەم کێشه ترسناکەدا، کێشەی گێچەڵی تورکیا بەکوردستان، یەک نییه؟

ئەی بۆ کەس یان ڕاستتر میدیای ئێمه ناپرسێت:

بەڕاست ئێوه ڕێککەوتنی ستراتیجیتان مۆر نەکرد؟

ئەریَ ئەو ڕێککەوتنە هەر بۆ کپکردنی دەنگە جیاوازەکان بوو؟

هێرشی ڕۆژنامەوانی کورد دەکەوێتە ناو بازنەی ڕێککەوتنی ستراتیجی کوردەوە، بەلاَم ئایا هێرشی تورکیا لە دەرەوەی ئەو بازنەیەیە؟

بۆچ ئەو ڕێککەوتنە بۆ دەم داخستنی ناو ماڵی خۆمان ئەوەندە تیژە و بۆ وەلاَمی پەلامار و سووکایەتییەکانی تورکیا ئەوەندە کولە؟

بۆ؟ تکایە وەلاَم بدەنەوە....

بۆ کە ڕۆژنامەوانێکی کورد ڕەخنەیەکی لەگول کاڵتر لە سەرۆکێک، بەرپرسێک بگرێت، کەللەیی دەبن، ئەی بۆ سوپاسالاری تورک یەشار بییوککانت کە بەسەرۆکەکانی کورد دەڵێت: ئەوانە تیرۆریستن، کەس وەلاَمی ناداتەوە؟

سەرباری نادیموکراتبوونی تورکیا، سەرباری دڕندەییی سوپاکەیان و سەرباری نادیموکراتبوونی ئەردۆگان، عەبدوڵلا گوڵ و پارتەکەیان، کەچی ئەوان نیشتمانێکیان هەیە میدیا تێیدا کراوە و ڕوونە.

نیشتمانی ئێمە، نیشتمانێکە بێ میدیا، نیشتمانی بێ میدیا پڕە لە چاوبەستی و تژەیە لە درۆ.

ڕۆژنامەی "حورییەت"ی تورکیا ڕۆژنامەیەکە نزیک لە لەشکری تورک و هەڵگری ئالاَی پاراستنی کەمالیزمە. ڕۆژی ٢٠٠٨/٢/٢٧ لە هەواڵێکیدا بەناونیشانی "ئاڵۆزی لەگەڵ ئەمەریکادا" دەنووسێت:

*"جێگری سەرۆکی ئەمریکا دیک چینی، ئەو پیاوەی مێشکی بەڕێوەبەرایەتیی واشنتۆن و چاوساغی شەرکەرانە، سەردانی بڕیاردراوی بۆ ئەنکارا لە دواجاردا*

هەڵوەشاندەوە.

*لە پشت کەوالیسەکانی پایەتەختەوە نەهاتنی چینی بۆ تورکیا وا لێک دەدرێتەوە کە ئاڵۆزی لە نێوان واشنتۆن و ئەنکارەدا هەیە.*

*سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان دەڵێن: "کاتی هاتنی چینی بۆ تورکیا ناڕوونە".*

*"ئەمشەویش وەزیری پاراستنی ئەمەریکا ڕۆبێرت گەیتس دەگاتە ئەنکارا. گەیتس بەر لە هاتنی ئەوەی ڕاگەیاند کە درێژترین کات بۆ بەردەوامیی ئۆپەراسیۆنەکان دوو هەفتەی ترە، ئەگەرنا ئێمە کۆمەکی جاسوسیمان ڕادەگرین"*

ئەمەیش بەبۆچوونی ڕۆژنامەکە ئاڵۆزییە لە پێوەندییەکاندا و شتێکی تری پێ ناگوترێت. پاشتریش هیچ سەرچاوەیەکی فەرمی دەوڵەت ئەو هەواڵانەی بەدرۆ نەخستەوە.

ئایا ئێمە ناتوانین ئەوەندەی تورکیا ڕوون و کراوە بین؟ ئایا بۆ حکوومەتی کوردستان، حزبەکانی کوردستان و میدیاکانیان باس لە چۆنیەتیی پێوەندی کورد و ئەمەریکا ناکەن؟

بۆچ باس لەوە ناکەن بۆ ئەمەریکای هاوپەیمان نەک بێدەنگە لە بۆردمانی تورک بۆ سەر کوردستان، بگرە کاری جاسوسیشیان بۆ دەکات؟

ناوەندەی بڕیار و دەسەڵاتی سیاسی کوردی تا ئەم ڕۆژەیش، سادە بیر دەکەنەوە و ئاڵۆزیش قسان دەکەن.

ڕاستییەکەی هێشتا دەسەڵاتی ئێمە لەوە نەگەیشتووە کرانەوە و

ڕوونیەیتی ستوونێکی چەند پتەوە لە ستوونەکانی دنیای دیموکرات و پێشکەوتوو. جێگەی داخە ئەوان بەبیرکردنەوەیەکەوە مامەڵە لەگەڵ زانیاری و هەواڵدا دەکەن مامەڵەی سەردەمە کۆنەکانە.

هەموو ئەو دەسەڵاتانەیش بەو شێوە ناڕوونە مامەڵە لەگەڵ زانیاری و هەواڵدا دەکەن جێگەی گومانن. جێگەی گومانن و هاوکات ئەوانیش گومان لە هەموو ئەوانی تر دەکەن. لە کەشی گومانکردن و نادڵنیاییشدا ئەوەی دەبێت بەقوربانی متمانەیە.

***

نیشتمانی بێ میدیا، نیشتمانێکە دەردەدار و لێوبەبار. نیشتمانی بێ میدیا لە مرۆڤی کەڕ و لاڵ دەچێت، ناتوانێت ئاگای لە شتگەلی دەوروبەری خۆی بێت.

حەڤدە ساڵە بڕێکی بەرچاو لە سامانی کوردستان بۆ میدیای حزبی بەهەدەر دەچێت، کەچی خەڵکی کورد لە کاتی هەموو تەنگژەکاندا لە کەناڵی میدیای ناکوردییەوە زانیاری وەردەگرێت.

کێ بەرپرسیارە لەوەی کورد میدیای نییە؟

## بێ خەم سەرخستنە سەر سەرین

کات لەوە بەنرخترە لە شتی پڕوپووچدا بەفیڕۆی بدەیت.

هاینتز ڕویمان ١٩٠٢ - ١٩٩٤ ناسراوترین

شانۆکاری ئەڵمان لە سەدەی بیستەمدا

ڕۆژی هەینی ٢٠٠٨/٢/٢٩ لەشکری تورک لە شەڕی سەرسنوور "باشووری کوردستان" کشایەوە. میدیای تورکی، عەرەبی و جیهانی سەرنجڕاکێشانە ئەم کشانەوەیەیان ڕووپێو کرد. هەواڵی کشانەوەی تورکیا ڕاپۆرتە هەواڵ و شرۆڤەی زۆری لە میدیاکاندا بەخۆ ڕاهێنا. مرۆڤ دەیتوانی بەخوێندنەوەی ئەو بابەتانەی زانیاری ورد لەسەر ڕووداوەکە بەدەست بخات، هەروەها میدیاگەلی جیهانی لە پاڵ هەواڵ و شرۆڤەکاندا ڕاپۆرت و زانیاری گرنگیان لەسەر کێشەی کورد لە تورکیا و لە عێراقدا بڵاو کردەوە.

میدیای کوردی و سەرجەم تۆڕەکانی ئینتەرنێتیان لە دەمی ئەم ڕووداوەدا چەقیبوون و نوێ نەدەکرانەوە.

کشانەوەی تورکیا تاکو ئیمڕۆ ٢٠٠٨/٣/٣ هیچ شوێنێکی گرنگی لە ڕووبەری میدیای کوردیدا نەگرت. دیارە ئیتر کاتی کشانەوەکە بۆ هەواڵسازی بەسەرچوو. لە کاتێکدا ژمارەی ئەو کەسانەی ئەم کشانەوەیەیان پێ ڕووداوێکی گەلێ گرنگە، زۆرن.

نازاندرێت هۆکاری ئەو بێدەنگییەی میدیای کوردی چ بوو؟

ئایا لە سۆنگەی ئەوەدا بوو کشانەوەکە کەوتە ڕۆژی هەینییەوە، میدیا بێ ئاگا و بێ خەم بوو، یان ئەو میدیایە هەر بۆخۆی میدیایەکە سست و تەپیو؟

دیارە کەمێک پێوەندی بەوەوە هەس کشانەوەکە کەوتە ڕۆژی هەینییەوە. میدیای کوردی هەینییان بەدرێژایی ڕۆژەکە دەخەوێت بۆ ئەوەی بڵێن زاهیدە و نانوێ بەشەو(*)".

ئەم شتەی ئێمە لە ناچاریدا "میدیای کوردیی پێ دەڵێین، ئەگەر کارەکانی خۆی بەشێوەیەکی شیاو ڕێک بخات، ئەوا دەتوانێ لە هەینییانیشدا هەمان وزەی کار ئامادە بکات، بەڵام دیارە ئامادەکردنی ئەو وزەی کارە دەبێ بیرکردنەوەی شایانی لە پشتەوە بێت.

ئەو ڕۆژە "هەینی ۲۹/۲/۲۰۰۸ کە لەشکری تورک کشایەوە" هەموو ماڵپەڕە کوردییەکان، هەر هەموو نوێ نەدەکرانەوە. تورک کشایەوە و میدیای کوردی لەو پێوەندییەدا یەک هەواڵی ڕانەگەیاند. بۆ؟ چونکە ڕۆژی هەینی بوو. چونکە هەموو ڕاگەیاندنی کوردی لە خەوی شیریندا بوون؟

دواتر، زۆر دواتر دەمە و نیوەڕۆی هەمان ڕۆژی هەینی، هەندێک لە ماڵپەڕە کوردییەکان لە خەو ڕابوون و بەدەم باوێشکدانەوە هەندێ ڕستەی ناتەواویان تۆمار کردبوو. بەڵام پاش ئەوەی هەموو میدیای بەنێوبانگی دنیا هەواڵەکەی چەندین جار نوێ کردەوە و بڵاوی دەکردەوە.

---

(*) لازمە بۆ شێخ سبەینان گورگەخەو
تا بڵێن شێخ زاهیدە و نانوێ بەشەو
شێخ ڕەزای تاڵەبانی

ڕاستی نازانم بۆ هەمووان ناپرسن، ئایا ڕەوشی میدیا لە وڵاتی ئێمەدا بۆ وەهایە؟ ئایا ئەم میدیایە دەهێنێت ئەوەندە خەڵکی بۆ بخرێتە کارەوە و ئەوەندەیش خەرجیی بۆ بکرێت؟

میدیایەک بەردەوام بێ خەم سەربخاتە سەر سەرین، بەردەوام لە دەمی تەنگژەکاندا، لە کاتە چارەنووسسازەکاندا لە خەودا بێت، ئایا هەبوونی پێویستە؟ ئایا ڕاستتر ئەم شتەی شوێنی میدیای داگیر کردووە چۆن دەکرێت نەهێڵدرێت و لە بری ئەو شتە میدیایەک لە کوردستان دروست بکرێت؟

تورکیا کشابووەوە کەچی ڕۆژنامەی کوردی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بەم مانشێتەوە مابووەوە و نوێ نەکرابووەوە:

**"ئەگەر تورکیا بێتە کوردستانەوە، کورد شەڕی پارتیزانی دەست پێ دەکات. پەرلەمان داوا دەکات پێشمەرگە و پۆلیس و ئاسایش بخرێنە ئامادەباشییەوە**، ئەمە کاری یەکێک لە چالاکترین ماڵپەڕگەلی میدیای کوردییە". ئایا میدیکارانی کورد دەزانن ئەوە بۆ میدیا واتای مەرگ دەگەیەنێت؟

هەمان ڕۆژ هەینی ٢٠٠٨/٢/٢٩، لە لایەن سەرۆکایەتیی کۆماری عێراقەوە فەرمانی لە سێدارەدانی عەلی کیمیاویی واژۆ کرا. میدیاگەلی جیهانی بەگرنگی و وردەکاریی زۆرەوە هەواڵەکەیان بڵاو کردەوە، لەگەڵ چەندین پرۆفیل و دۆسیەی تایبەت لەسەر عەلی کیمیاوی، سەدام حوسێن، بەعس، عێراق، کورد و بابەتی پێوەندیداری دیکە." میدیای کوردی لەم هەواڵەیشدا دیسان سستی و دەست و پێ سپێیەتیی خۆی پیشان دایەوە. باشە بۆ دەبێ تا ئێستا میدیای کوردی پرۆفیلی عەلی کیمیاویی نەبێت؟

وەکو نموونەیەک میدیای ئەڵمان دەنووسم، بۆ دەبێ میدیای ئەڵمان بەشێوەیەکی شیاو هەواڵەکە بدات و بۆ دەبێ میدیای کوردی پاش چەند ڕۆژ هەواڵەکە نیوەناچڵ و بەشێوەیەک بڵاویکاتەوە کە زۆر بێ ئاست بێت؟

ئەمە مانشێتی ڕۆژی ٢٠٠٨/٢/٢٩ی ماڵپەڕی شپیگل ئۆنلاینی ئەڵمانییە:

**سەرۆک دەوڵەت بڕیاری مردنی عەلی کیمیاوی پەسەند دەکات.**

سەرۆک دەوڵەت "کورد" بڕیاری لە سێدارەدانی بکەری "ئەنفال" و بکوژی هەڵەبجە واژۆ دەکات.

میدیای کوردی لەو ڕستەیەدا ئەم شتانە دەبینێت؟

ڕستەیەکی چەند پڕ واتا؟

ڕستەیەک چەند شتی لە خۆ گرتووە؟

لە ژێر هەمان مانشێتەوە هەواڵەکە بەم ڕستەیە دەست پێ دەکات:

**عەلی کیمیاوی لە سێدارە دەدرێت.**

میدیایەکی دیکەی ئەڵمانی دەنووسێت:

**"لە سێدارەدانی "عەلی کیمیاوی" یەکلایی بووەوە."**

NZZ ** کە بەنێوبانگترین و بەپرێستیژترین ڕۆژنامەی ئەڵمانی زمانە ڕۆژی ٢٠٠٨/٢/٢٩ لە ماڵپەڕی خۆیدا ئەو ڕستەیەی سەرەوەی نووسیوە.

ڕاگەیاندنی کوردی بێ هاوتا و بێ نموونەیە، ڕاگەیاندنێک

---

(**) ڕۆژنامەی "نۆیە تزویریشەر تزایتونگ - ڕۆژنامەی نوێی زویریخییەکان" کۆنترین ڕۆژنامەی بەردەوامی ئەڵمانی زمانە. یەکەم ژمارەی لە ڕۆژی ١٧٨٠/١/١٢دا دەرچووە.

نییه ئەوەندە بێ خەم سەر بخاتە سەر سەرین.
ڕاگەیاندنێک نییە ئەوەندە بێ خەیاڵ، خەیاڵ ئەو کەرەستە هەرە پێویستەی کاری ڕۆژنامەوانی. لەپای بەدەستخستنی هەواڵ و زانیاریدا، چاوەڕوانیکردنی ئەم میدیایە جگە لە بەفیڕۆدانی کات هیچ واتایەکی دیکە ناگەیەنێت.

# هەڵ - چنین و دارشتن

کورت بنووسە، نووسینەکە دەخوێندرێتەوە.

ڕوون بنووسە، لە نووسینەکەت تێ دەگەن.

وێنەســـــازانە بنووســـــە، نووســـــینەکـــــە لە یادەوەریدا دەپارێزدرێت.

ڕۆژنامەوانی هەنگاری - ئەمەریکی جۆزیف

پولیتزەر ١٠/٤/١٨٤٧- ٢٩/١٠/١٩١١

با تەمـاشـایەکی ئەم دارشتن و هەڵچنینانە بکەین. ئەمـانە نموونەی ڕۆژنامە ناسراوەکانی کوردستانن.

نموونەکان وەکو خۆیان دەنووسمەوە:

نموونەیەک لە ڕۆژنامەی ئاسۆ:

(هێزەکانی تورکیا بەردەوامە لەسەر کۆکردنەوەی هێزەکانی لەسەر سنوورەکانی هەرێم و وتەبێژی پاراستنی هەرێمیش ناردنی هێـزەکـانیـان بۆ سنوور ڕەت دەکـاتەوە و ڕای دەگـەیەنێت کـە هێـز لەسـەر سنوور دانانێن، چونکە ئەوە ئەرکی حکومـەتی فـیـدراڵە و لە هێـرشـەکـەی دوێنێـدا گۆڕستانێکی گەریلاکان بەئامانج گیراوە).

(تا ئێستا هیچ زیانێکی ماددی ڕووی نەداوە ئەو شوێنانەی پێکدادانی لێ ڕوویداوە هەمـوویان پێـشـتـر چۆڵ کـراون

پێکدادان تەنیا لە نێوان پەکەکە و تورکیا ڕوویان داوە تۆپباران کردنەکانیش بەفڕۆکە و تۆپ بووە).

ڕۆژنامەی ئاسۆ ژمارە ٦٥٢ ڕۆژی شەممە

٢٠٠٨/٢/٢٣ لاپەڕە یەک.

ڕۆژنامەی ئاسۆ لە داڕشتنی ئەم هەواڵە و زۆر هەواڵی دیکەیدا، جگە لەوە زمانێکی تێکەڵ و پێکەڵی هەیە و هیچ زانیارییەک بەدەستەوە نادات، هەروەها خاڵبەندی، داڕشتن و هەڵچنین لەبەرچاو ناگرێت و لەکاتی خوێندنەوەی هەواڵی وەهادا هەناسەی خوێنەر تەنگ دەبێت و ناتوانێت تاسەر لە خوێندنەوەی هەواڵەکە بەردەوام بێت.

بڵاوکردنەوەی ئەم هەواڵە لە ڕۆژنامەیەکی ناسراوی وەکو ئاسۆدا و لە ڕۆژگارێکدا خەڵک پێویستی بەزانیاری دروست، ڕوون و زەلال هەیە چ واتایەک دەبەخشێ؟ ئایا ڕۆژنامەی ئاسۆ "و ڕۆژنامەکانی دیکەی کوردستان" ڕۆژانە پلان بۆ کاری خۆیان دادەڕێژن؟ ئایا ئەو ڕۆژنامانە هەموو ڕۆژ کاری ڕۆژی ڕابردوویان هەڵدەسەنگێنن؟

ئەفسووس ڕۆژنامەگەلی کوردی بەو زمانە چەوتە دەنووسن و بەو زمانە خراپە هەواڵ دادەڕێژن. جێگەی داخە ساڵانێکی زۆرە میدیای ئێمە لە کارایە و ئەوەندە کادری کارامەی بەرهەم نەهێناوە هەر هەموو پێکەوە بتوانن ڕۆژنامەیەک "یان تەلەفزیۆنێک"ی بێ کەموکوڕی بەڕێوە ببەن.

کێ لەم ڕەوشە بەرپرسیارە؟

نموونەیەک لە ڕۆژنامەی خەبات:

( بۆ ئاگاداربوون لە ڕەوشی دەڤەرەکە و تاوتوکردنی

پێشهاتە تازەکان لە دوای هێرشەکانی تورکیا بۆ سەر خاکی هەرێمی کوردستان و ئیحتیواکردنی وەزعەکە دوێنێ بەڕێز مەسعود بارزانی سەرۆکی کوردستان لەگەڵ بەرپرسانی دامودەزگا پەیوەندارەکانی ئیداری و ئەمنی و عەسکەری دهۆک کۆبۆوە تەئکیدی لەوە کردەوە کە ئێمە لەگەڵ شەڕ و بارگرژی و چارەسەری عەسکەری گرفتەکان نین و ئەوە تەعەداییکە لە خەڵکی کوردستان دەکرێ لە لایەن سوپای تورکیاوە.)

ڕۆژنامەی خەبات ژ. ٢٧٧٠ ڕۆژی ٢٠٠٨/٢/٢٣ لاپەڕە یەک.

ئایا ئەوە هەواڵە ڕۆژنامەی خەبات بڵاوی کردووەتەوە؟

گەلۆ ئەوە زمانی داڕشتن و نووسینە یان زمانی قسەکردنی ئاسایی ئاخاوتنی ڕۆژانە؟ ئایا بەکارهێنانی ئەو هەموو وشە ناکوردییە لە هەواڵێکی وا کورتدا چ دەگەیەنێت؟

ئایا بەکارهێنانی وشەگەلی ناکوردی وەکو:

"تەئکید، تەعەدا، ئیداری، ئەمنی، عەسکەری و ئیحتیواکردنی وەزعەکە" کەرەستەی ئەوەن هەواڵیان پێ هەڵبچنین؟ ڕاستە ئێمە هەموومان لە قسەکردنی ڕۆژانەدا سەدان لەم وشانە بەکار دەهێنین و هیچ نەنگی نییە، بەڵام زمانی نووسین دەبێ زمانێکی ڕەوان و پەتی بێ.

ئایا بۆ لەم هەواڵە و لە زۆرینەی هەواڵەکانی دیکەی ئەو ڕۆژنامەیەدا ڕەچاوی خاڵبەندی ناکرێت؟ ئایا ئەم ڕۆژنامەیە سەرنووسەر و

بەرپرسی بەشی هەواڵی هەس؟ ئەگەر هەن بۆ ئەم "کارەساتە ڕۆژنامەوانییە" بە بەرچاوی هەموویاندا دەرباز دەبێت و چاوی کەسیان نایبینێت؟

ئایا ئەگەر ئەو ڕۆژنامەوانانەی کە دەبن بە پەیامنێری شەڕ و لە ناوچەی ئاڵۆزی شەڕەوە هەواڵ ئامادە دەکەن، دارشتنەکانیان وەکو ئەو هەواڵە بێت، کەس زانیاریی دروستی سەبارەت بەشەڕ پێ دەگات؟

ئەمە لە کاتێکدا ئەو هەواڵەی ڕۆژنامەی خەبات لە شاری هەولێر و لەو پەڕی ئارامیدا نووسراوە، کەواتە بۆ دەبێ ئەوەندە شێواو و نەشیاو ئامادە کرابێت؟

ئایا ڕۆژنامەی خەبات چەند کارمەندی هەیە و بۆ بەو هەموو کارمەندەوە هەڵچنینی هەواڵی ئەوەندە ناجۆر و زمانی دارشتنی ئەوەندە شەکەتە؟

هەر لە ڕۆژنامەی خەبات لە ژمارەی ٢٨٦٢ی ڕۆژی ٢٠٠٨/٥/٢٨دا، لە هەواڵی سەرەکیی یەکەم لاپەڕەدا هەواڵی هاتنی شاندێک بڵاوکراوەتەوە. خەبات لەبری ئەوەی بنووسێت: شاندەکە سەردانی هەولێریان کرد، نووسیویەتی (تەشریفیان هێنابوو).

ئایا ئەمە زمانی ڕۆژنامە و ڕاگەیاندنە؟

لە ڕاگەیاندنی کوردیدا ئەو نموونانەی پڕن لە هەڵە و ناتەواوی و دوورن لە زمان و دارشتنی ڕاگەیاندن مەحاڵە هەموویان بەسەر بکرێنەوە، مەگەر پێگەیەکی تایبەتی ئینتەرنێت بۆ ئەو مەبەستە هەبێت و ڕۆژانە چەندین کارمەندی شارەزای بواری زمانی ڕاگەیاندن ئەو کارە بۆ میدیای کوردی بکات.

نموونەیەک لە ڕۆژنامەی هاوڵاتی:

"حکومەتی هەرێم شکاندنی ئابلۆقەی سەر بناری قەندیل ڕەت دەکاتەوە"

ڕۆژنامەی هاوڵاتی ژ. ٣٨٧ ڕۆژی ٢٠٠٨/١٢/١٣ لاپەڕە یەک.

لەم هەواڵە و لە گەلێ هەواڵی تری هاوڵاتیدا هەڵچنینی هەواڵ و زمانی داڕشتن زۆر ماندووە.

هەواڵەکانی ڕۆژنامەی هاوڵاتی بەجۆرێک ماندووەتییان پێوە دیارە خوێنەریش بەخۆیانەوە ماندوو دەکەن. لەو هەواڵەدا کە بەداڕشتنێکی زۆر لاواز دەس پێ دەکات، لێدوانی وتەبێژی حکومەتی هەرێم لە زمانی ئاخاوتنەوە نەکراوە بەزمانی نووسین، لێدوانەکە لە قاڵبی قسەکردنی "بەرپرس و قسەکەرەوە" نەکراوە بەزمانی نووسین. دیارە ئەمە گرفتێکی دیکەیە کە "بەرپرس و قسەکەرانی کوردستان" زۆربەیان توانای دەربڕین و لێدوانیان زۆر خراپە. لە هەواڵەکەدا ئەم وشەگەلە بەکارهاتوون " ئەمن و ئاسایش، ئیجرائات، فشار، یانیش، وەسیلە، شەرعی، یاساییەوەش، پێشی پابەند دەبین" کە کەرەستە نین بۆ هەڵچنینی هەواڵ و زەخیرەی زمانی نووسین نین. ئەم وشەگەلە نابێت لە زمانی هەواڵ و داڕشتنی ڕاگەیاندندا هەبن.

هەر لە هەمان ژمارەی ڕۆژنامەی هاوڵاتی دا و هەر لە لاپەڕەی یەکەمدا ئەم هەواڵەیش تەماش دەکەین:

١٠٩ کورد لە یۆنان و ٧٠ لە ئیتاڵیا دەستبەسەرن

ئەمەیش یەکێکی ترە لەو هەواڵانەی کە هیچ سیمایەکی زمانی

هەواڵ و داڕشتنی هەواڵیان پێوە دیار نییە. لە لاپەڕەی یەکەمی یەکێک لە ناسراوترین ڕۆژنامەکانی کوردستان و لەیەک ژمارەدا ئەم هەموو ناتەواوی و بێ بەرنامەییە ئایا کارێکە ئاسایی؟

نموونەیەک لە ڕۆژنامەی ئاوێنە:

دەرماڵەی مەترسی لە نەخۆشخانە شمولی کێ دەکات

ڕۆژنامەی ئاوێنە ژ. ١٠٩ ڕۆژی ٢٠٠٨/٢/١٩ لاپەڕە ١١

ڕەنگ بێ مەبەست لە بلاوکردنەوەی ئەو نووسینە ئەوە بووبێت ڕۆژنامەکە ڕاپۆرتێک لەسەر ئەو بابەتە پێشکەش بکات، بەلام لاوازیی داڕشتن و بێ کەڵکیی زانیارییەکان وایان کردووە نووسینەکە نەک هەر ئەو مەبەستە بەدەستەوە نەدات، بگرە بلاوکردنەوەی نووسینەکە جگە لە خەوشێک بۆ ڕۆژنامەکە هیچی دیکەی لێ بەرهەم نەهاتووە. نووسینەکە بەزمانێکی ساکار و بەهزرێکی لۆکاڵی داڕێژراوە. نموونەی ئەم نووسینانە لە ڕۆژنامەی ئاوێنەدا کەم نین.

سەرباری ناوەڕۆکەکەی، سەردێر "ناونیشان"ی نووسینەکە جۆرێکە یەکسەر ئاستی زمانزانیی ڕاگەیاندن و هەڵبژاردنی سەردێر لە ڕۆژنامەی ئاوێنەدا دەخاتە ڕوو.

نموونەیەک لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ:

ژمارەی ٤٥٨٠ی ڕۆژی ٢٠٠٨/٥/٢٥

یەکەم هەواڵی کوردستانی نوێ، لە سەری سەرەوە:

"بۆ تاووتوێکردنی دوا گۆڕانکارییەکانی پڕۆژەیاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکانی عێراق و ئەو کێشانەی بوونەتە بەربەست بۆ پەسندکردنی لە لایەن ئەنجوومەنی

نوێنەرانی عێراقەوە، بڕیارە ئەمڕۆ یەکلایی بکرێنەوە".

دیارە ئەمە یەکەم پەرەگرافی هەواڵێکە کە ئەو ڕۆژنامەیە شوێنێکی گرنگی لە لاپەڕە یەکی خۆیدا بۆ تەرخان کردووە، بەڵام بەداخەوە هەر لە یەکەم پەرەگرافەوە خوێنەر لە خوێندنەوەی هەواڵەکە ماندوو دەبێت، سارد دەبێتەوە و ناتوانێت بەردەوام بێت، هۆکاری ئەمەیش لاوازیی زمان و ئاستی خراپی دارشتنە.

ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ لە هەمان ژمارەیدا و لە هەواڵێکی تری سەرەکیدا بەهەمان زمانی لاواز دەنووسێت:

"ڕێکەوتن کرا لەسەر پێویستی پەلەکردن لە ناوی وەزیرە نوێیەکان".

ئەمەیش هەواڵێکە بەسەردێر و ناوەڕۆکەوە دەکەوێتە ئاستی بەرهەمهێنانی هەواڵەوە.

بەگشتی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ شێوازێکی هەیە لە داڕشتنی هەواڵدا زۆر زوو خوێنەر وەڕس دەکات. ئەم ڕۆژنامەیە کە زۆربەی هەواڵگەلی سەرەکی بۆ کاری حزب و حکومەت "ڕاستی دەبوو ڕاگەیاندنی کوردی بنووسن: حکومەت و حزب" تەرخان دەکات، لە سەرەتای هەر هەواڵێکیدا ئەوەندە ناوی بەرپرس و پۆستەکانیان ریز دەکات هەناسەی بەردەوامیی خوێندنەوە لەبەر خوێنەر دەبڕێت.

دیارە ریزکردنی ئەو ناوانە بۆ ڕۆژنامەگەلی حزبی ناچارییە، بەڵام کە وای لێ هات ئیدی کارەکە دەکەوێتە دەرەوەی بازنەی کاری ڕاگەیاندنی پیشەییەوە.

داڕشتنی درێژی نەشیاو، ڕستەی ناڕوون کە لە سروشتی ڕستەی

هەواڵەوە دوورە، هەڵچنینێک لە وشکە کەڵەک دەچێت، نا ڕاستی لە ناوەڕۆکی هەواڵدا، بەتایبەتی ئاماژەنەکردن بەئامار و فاکتەکان بووە بەهەوێنی هەڵچنین و هێڵی سەرەکی کارکردن لە میدیای کوردیدا.

## نەبوونی
## کە ڕاگەیاندن بێ بابەت بێت

ئەو مرۆڤەی هەرگیز ناخوێنێتەوە، بەئاگاترە لەوەی تەنها ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە

ڤالتەر شێل ۱۹۱۹/۷/۸ چوارەمین سەرۆکی
کۆماری فیدرالی ئەڵمانیا ۱۹۷٤-۱۹۷۹

نەبوونی بابەت یان دۆسیە لە میدیای کوردیدا کەلێن نییە، بگرە بێ بابەتی وای کردووە ئەو میدیایە سەرچاوەیەک بێت بەردەوام وشک. سەرچاوەیەک بێت بەردەوام شتێکی تر بەرهەم بهێنێت، شتێک جیاواز لە سروشتی بەرهەمبهێنانی خۆی.

نائامادەبوونی بابەت و نەبوونی فایل لە ڕاگەیاندنی کوردیدا ئەوە دەسەلمێنێت ئەم میدیایە میدیایەک نییە بگەڕێت، میدیایەک نییە ئەودالّی بابەت بێت و حەزی لە کاری پیشەیی هەبێت. ئەو میدیایە، میدیایەک نییە کادری پیشەیی هەبێت و فایلی تەواوی بابەتێک پێشکێش بکات. بێگومان میدیای لەم جۆرە، میدیایەکە دەست و پێ سپی و نەکردە.

میدیای کوردی هێشتا نەگەیشتووەتە ڕێکارێکی شیاوی وەها بەرهەمی پیشەیی خۆی بێ کێشە ببەخشێت. بۆیە میدیایەکە بێ دەسەلات.

میدیای کوردی دەبێ بەردەوام تیشک بخاتە سەر بابەتە گرنگ و پێویستەکان، تاکو زانیاری و ئاگاداری پێویست بەخەڵک ببەخشێت. لەسۆنگەی ئەو بێ دەسەڵاتییەوەیە تا ئێستا میدیای کوردی تیشکی پێویستی نەخستووتە سەر ئەم بابەتە گرنگانە:

* فایلی ئێران

پاشخانی ئێران، ڕابردووی دوور و نزیکی ئێران، ئێستای ئێران، ئێران و شیعەگەرایی، ئێران و کولتوور، ئێران سەرزەمینی نەتەوەگەل و کولتوورگەلی جودا، بۆ ئێمەیش لە هەمووی لە پێشتر ئێران و کورد، و تاد. سەبارەت بەم بابەتانە و دەیان لایەنی گرنگ و پێویستی دیکەی ئێران هیچ شتێکی ئەوتۆ لە ڕاگەیاندنی ئێمەدا نییە و بەرچاو ناکەوێت.

* ناساندنی تورکیا

تورکیا و دەوڵەتانی دراوسێی، مێژووی تورکیا، ڕابردووی دوور و نزیکی، تورکیا و مەسەلەی کورد نەک هەر لە ناوخۆی تورکیادا بگرە پرسی کورد وەکو مەترسییەک بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا (وەک تورکیا و ئەوروپا، بابەتگەلی وەکو دەوڵەتی قووڵ "دەرین دەڤلەت"*، مافیا لە تورکیا، سیستەمی ئیسلامی

(*) Derin Devlet واتای "دەوڵەتیی قووڵ. لە نێو دەوڵەتدا" ئەمە لە تورکیا زاراوەیەکی ناسراوە. ئەم دەوڵەتی قوڵە هێزگەلی سیاسی، دەزگاکانی ئاسایش، دەسەڵاتی دادوەری، بەڕێوەبەرایەتییەکان و ڕێکخراوەکانی کوشتن، بەتایبەتیش "کۆماندۆی کوشتن" دەگرێتەوە، ئەمانە کۆمەڵێ ستوونن کە ئەو دەوڵەتە شاراوەریەی لە نێو دەوڵەت لەسەریان بەندە. ڕووبەری قسەکردن سەبارەت بەدەوڵەتی قوڵ لەگەڵ سکاندالی سوسورلوک "١٩٩٧" دا فراوانتر=

سیاسی، ئەرگەنەکۆن* و... تاد.

سەبارەت بەم بابەتانە و دەیان لایەنی گرنگ و پێویستی تری تورکیا چ فایل و بابەتێک لە میدیای کوردیدا بڵاو کراوەتەوە؟ بێگومان سەبارەت بەو بابەتانە هیچ شتێکی ئەوتۆ لە ڕاگەیاندنی ئێمەدا نییە و بەرچاو ناکەوێت.

* دنیای عەرەب

پێوەندیی ئێمە و عەرەب و ئیسلام یەکێکە لە بابەتە زۆر گرنگەکان، بەڵام کوا بۆ ئەم بابەتانە یان نائامادەیە یاخۆ زۆر ناجۆرانە قسەی

= بوو. دەوڵەتی قوڵ لە حەفتاکانی سەدەی بیست لە ڕێگەی دەزگاگەلی نهێنی وەکو "کۆنترگەریلا" "بەڕێوەبەرایەتیی شەڕی تایبەت، کارەکانی خۆی بەڕێوە دەبرد.

JITEM هێزی ژەندرمەی نهێنی، ئەم هێزە فەرمییە و یەکێکە لە دەزگا ترسناک و بەهێزەکامی دەوڵەتی قوڵ. لەو ڕۆژەوەی تورکیا سالّی ١٩٥١ بوو بە ئەندامی ناتۆ، ئەم سازمانانەی بەمەبەستی پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ و بنەماکانی کەمالیزم هەس.

* Ergenekon ڕەگی وشەکە دیار نییە. ئەفسانەیەکە باس لە بڵاوبوونەوەی نەژادی تورک دەکات. ئەفسانەکە بەناوی دۆڵێکەوە ناودێر کراوە کە تورکەکان لە بنەڕەتدا لەوێوە کۆچیان کردووە و بەجیهاندا بڵاو بوونەتەوە. یەکێک لە ڕێکخستنە گرنگ و نهێنییەکانی دەوڵەتی قوڵە. ئەم دەزگا نهێنییە لە پای پاراستنی بنەماکانی کەمالیزمدا زۆر کاری وەکو کوشتن، تۆقاندن و تیرۆری پەیڕەو کردووە و دەیکات. بازرگانیکردن بەمادە هۆشبەرەکانەوە یەکێکە لە کارە بازرگانییەکانیان و سەرچاوەی داراییانە. ئەرگەنەکۆن بەردەوام هاوکاریی ڕێکخستنەکانی مافیا، کوشتن و تۆقین دەکات و دەیانژێنێت. لە ناو ئەندامانی ئەرگەنەکۆندا پارێزەران هەن کە بەشدارییان کردووە لە دادگای دژ بە کەسانی وەکو ئۆرهان پاموکی نووسەری تورک، هەڵگری خەلاتی نۆبل بۆ=

لەبارەوە كـراوە. مـێژووی عـەرەب وەكـو ئەوەی هـەیە، لە بـڵاوكـردنەوەی كولـتوور، زمـان و نـەریتی خـۆیاندا گـیانی پاوانـخوازی، ئەو باندۆرەی "باش یان خـراپ" عەرەب لەسـەر ئـێمـە دروسـتی كردووە و پێـوەندیی ئێستا و داهاتوومان بەعەرەبەوە و تاد.

سـەبارەت بەم بابەتانە و دەیان لایەنی گرنگ و پێویستی دیكە ئێمـە و دنیـای عـەرەب هیچ شـتـێكی ئەوتـۆ لە ڕاگـەیاندنی ئێـمـەدا نیـیـە و بەرچاو ناكەوێت.

* ئیسلامی سیاسی

هۆكـارەكانی سـەرهەڵدان و گـەشـەكردنـی ئیسـلامی سیـاسـی لای ئێمـە، لە ناوچەكە و لە جیـهاندا، لە كاتێكدا مـیدیای ڕۆژئاوای دوور لە

= ئەدەبیات و هـرانت دینكی ڕۆژنامـەوانی ئـەرمـەنی كە ساڵی ٢٠٠٧ لە تـوركیا تیرۆر كرا
هەروەها ژەنەراڵگەلی خانەنشینیش هەن كە ئەندامی ئەرگەنەكۆنن.
لە بواری كوشتندا ئەرگەنەكۆن ئەم تاوانانەی كردووە:
كوشتنی سێ مژدەبەری دیان لە مەلاتیا، ساڵی ٢٠٠٧
كوشتنی هرانت دینك، ڕۆژنامەوانی ئەرمەنی ٢٠٠٧
كوشتنی قەشەیەكی دیان لە شاری ترابزۆن ٢٠٠٦
نانەوەی بۆمبا بۆ ڕۆژنامەی جمهورییەت لە شاری ئیستەمبوڵ.
ئەرگەنەكۆن هەوڵی كوشتنی ئەم كەسانەیشی داوە:
ئۆرهان پامۆك: نووسەری تورك
ئەحمەد تورك: سیاسەتوانی كورد
ئوسمان بایدەمیر: سیاسەتوانی كورد
لەیلا زانا: سیاسەتوانی كورد
فەهمی كۆرو: گۆشەنووسی تورك

زمانی عەرەبی و کولتووری ئیسلام بەردەوام بابەتی سەرنجڕاکێش و پڕ زانیاری بڵاو دەکەنەوە، ئەی بۆ کادری عەرەبیزان و ئیسلام ناسی ئێمە بەرهەمێکی ئەوتۆی لەو بوارەدا پێشکێش نەکردووە؟

تا ئێستا میدیای ئێمە چەند کادری پسپۆری پەروەردە و ئامادە کردووە بۆ ئەوەی قسە لەسەر ئیسلامی سیاسی بکات؟ دیارە مەبەست لە قسەکردن قسەیەکە گوێی لێ بگیرێت و کە خوێندرایشەوە یان بیسترایش ببێت بەسەرچاوەی زانیاری، گفتوگۆ بێنێتە ئاراوە و بۆچوون دروست بکات.

سەبارەت بەبابەتی ئیسلامی سیاسی ڕاگەیاندنی کوردی زۆر قسەی کردووە، بەڵام زۆربەی بێ حیسێب کراوە و خاڵین لە زانیاری. لەبارەی دەیان لایەنی گرنگ و پێویستی دیکەی ئەم بابەتەیش هیچ شتێکی ئەوتۆ لە ڕاگەیاندنی ئێمەدا نییە و بەرچاو ناکەوێت.

ئامادەنەبوونی فایلی ئەو بابەتانە بۆ چی دەگەڕێتەوە؟ بێگومان بۆ نەبوونی کادری شارەزا و کەسانی پسپۆڕ لەو بوارانەدا. کادری شارەزا و میدیاکاریش چۆن دروست دەبێت ئەگەر ئامادەکاری بۆ نەکرێت؟

ئایا ئەرشیڤی ڕاگەیاندنی کوردی هەمووی بگەڕێین شتێکی شایان باس و بەکەڵکمان سەبارەت بەو بابەتانە دەست دەکەوێت کە ئاماژەیان پێ کرا؟

بێگومان هەر ئەم بابەتانە نین لە ڕووبەری میدیای ئێمەدا نا ئامادەن، بگرە بابەتی تر زۆرن ڕۆژانە دنیای ئێمە تێک دەشکێنن و دنیای ئێمە بەئاراستەی ترسناکدا دەبەن و میدیای کوردیش شتێکی ئەوتۆیان دەربارە نابەخشێت.

ڕەنگ بێ میدیای کوردی بیانوویەکی بۆ ئەوە هەبێت کە ناتوانێت سەبارەت بەو بابەتانەی ئاماژەی پێ کرا فایلی شایان ئامادە و پێشکێش بکات، بەڵام خۆ دەتوانێ لەناوخۆی نیشتماندا کار لەسەر بابەتەکانی کۆمەڵ بکات. میدیای کوردی کاری لەسەر کۆمەڵ نەکردووە.

میدیای کوردی تیشک ناخاتە سەر گەندەڵیی کۆمەڵی کوردەواری خۆی. میدیای کوردی باسی مرۆڤی کورد ناکات کە دەبێ چ ئەرک و مافێکی لەو نیشتمانەدا هەبێت.

میدیای کوردی بابەتگەلێک سەبارەت بەژینگە پێشکێش ناکات کە چۆن مرۆڤی کورد وڵاتی پاکژی خۆی پیس دەکات و چۆن کوردستان دەکات بەزبڵخانە.

کۆمەڵی کوردەواری جەستەیەکە سەرتاپا نەخۆش و دەردەدار. میدیای کوردی شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بەو دەردانە پێشکێش ناکات جەستەی وڵات و کۆمەڵی ئێمەیان داڕزاندووە. دەسەڵاتی ناجۆر بەرهەمی جەستەیەکی نەخۆشە، دەنا لۆجیک نییە خەڵکێکی تەندروست دەسەڵاتی ناتەندروست بەرهەم بهێنێت یان پەسەندی بکات.

بازرگانی چاوچنۆک و نەزان کە خۆراکی ژاراوی دەهێنن و دەرخواردی خەڵکی دەدەن، دوکتۆری بێ ویژدان کە چەندین نەخۆش و تووشبوو سەرگەردان دەکەن، ئەندازیاری بێ پلان و دەست و پێ سپی کە ناتوانن بستێک بالای ئەو وڵاتە هەڵکشێننە سەرێ، کارمەندێکی زۆر کە کەسی حەز لەکاری خۆی ناکات، کەسانێکی زۆر کە ڕێزی کاری خۆیان و کاری ئەوانی تر ناگرن. هتد ئەمانە و دەیان دەردی

تری جەستەی ئەو نیشتمانەیان داڕزاندووە و میدیای کوردیش خۆی بە شتی زۆر بچووکەوە سەرقاڵ کردووە.

سەرباری ئەم بابەتە، کۆمەڵێ شتی تری پێویست هەن کە پێویستییان بەوەیە بەدەنگی بەرز قسەیان لەسەر بکرێت، کەچی ڕاگەیاندنی کوردی ئەگەر باسیشیان بکات بەنووزە باسیان دەکات.

پرسگەلی وەکو هەژاری، کارەساتەکانی کورد، ڕابردوو، ئێستا و داهاتووی ئەو گەل و نیشتمانە، پرسی نەوەکان، پرسی یەکسانی، لەو بابەتانەن دەبێ بەردەوام ئامادەبن، کەچی بەردەوام لە ڕووبەری ڕاگەیاندنی کوردیدا بزرن. بۆ میدیای کوردی کار لەسەر ئەم بابەتانە ناکات؟ ئایا نایەوێت کاری لەسەر بکات یان چاوی میدیای کوردی ئەو شتگەلە نابینێت و پەی بەپێویستییان نابات؟

## میدیای بێ یادەوەری و بێ ئارشیف

### تۆڵەی ڕۆژنامەوان لە سیاسەتوانان ئارشیڤە

ڕۆبێرت هۆکنەر، دەرهێنەری شانۆ، ڕۆژنامەوان

و بێژەری ئۆتریشی ١٩٤٥-٢٠٠١

میدیایەک بێ زەخیرەی یاد و بێ کەرەستەی زانیاری و چوونەوە سەر، میدیایەکە بێ پێ، میدیایەکە ناتوانێ خۆی ڕابگرێت و توانای ڕێکردنی نییە.

میدیای بێ ئارشیڤ میدیایەکە نابینا. میدیای لەو جۆرە توانای بینینی پاش و پێشی خۆی نابێت. میدیایەکە نە دوێنێی خۆی دەبینێت نە سبەینێی. بەچاوخشاندنێکی خێرا بە بەرهەمەکانی میدیای کوردیدا دەردەکەوێت، ئەو میدیایە بێ ئەوەی وردەکاری، ژمارە، مێژوو، شتگەلی پێویستی دوێنێی، پاراستبێت، ئەمڕۆ دەست بەکارە و سەبارەت بەهەموو شتەکانی دوێنی و ئەمڕۆ شت دەنووسێت و بەرهەم دەبەخشێت.

نەبوونی بانکی زانیاری "داتەن بانک" و نەبوونی ئارشیڤ چ هی کەسەکان، چ هی مێژووی ڕووداوەکان و وردەکاری پێویست وای کردووە متمانەی ئەم میدیایە زۆر لە خوارەوە بێت.

نەتوانینی بەکارهێنانەوە و بەگەڕخستنەوەی نزیکەی هیچ شتێکی ڕابردوو چونکە ناپارێزێت کارێکی نالەباری لەم ڕاگەیاندنە کردووە.

ئەوە لە کاتێکدا پاراستن و بەکارهێنانەوەی ئەو زانیاری و کەرەستە پێویستانە لە ئەمڕۆدا کارێکە ئاسان و خۆش دەست.

چ ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و ناوەندێکی ئێمە بانکی زانیاریی شیاو، ئارشیڤی پێویست و یادەوەریی بەهێزی هەس؟ ڕاگەیاندنی ئێمە بەهەڵە زانیاری بزووتنەوەی بەرگری کورد لە شەستەکان "سەدەی بیست" بەدواوە بڵاو دەکاتەوە. ڕاگەیاندنی وەها جگە لەوە خۆی و خەڵک بێ هوودە سەرقاڵ دەکات، شتێکی تر بەرهەم ناهێنێت.

نەک هەر ئەوە، بگرە ڕاگەیاندنی کوردی زۆر بەئاستەم دەچێتەوە سەر ڕووداوەکانی حەفتا و هەشتاکان "سەدەی بیست" یان لە کاتێکدا شتێکیان لەبارەوە دەڵێت زانیاری و وردەکاری شێواو پێشکێش دەکات. جا ئایا میدیایەک توانای بەگەڕخستنی ئارشیف و بەرۆژەڤکردنەوەی یادەوەریی ئەوەندە ژار بێت، گەلۆ لە باسکردن و بەسەرکردنەوەی میرایەتی کوردی و گەڕانەوە بۆ سەردەمی شەرەفخان و خانی و کێ و کێ دەبێ چەند چاومارانە کار بکات و چەندێک زانیاریی دروست پێشکێش بکات؟

لە سۆنگەی بێ ئارشیڤی و یادەوەری لاوازدایە ڕاگەیاندنی کوردی ناتوانێ دەست بۆ کۆمەڵێ شتی گرنگ ببات. هەموومان دەبینین کە ڕووداوێکی گرنگ و کتوپڕ دەقەومێ ئەو میدیایە هیچ زەخیرەیەکی نییە بچێتەوە سەری و هەواڵ و شرۆڤەی لەسەر بنیات بنێت.

لە داڕشتن و پێکهاتەی هەواڵەکاندا بەڕوونی ئەوە دەبینین کە یادەوەری کارمەندان و کارگێڕانی ئەو میدیایەش وەکو ئارشیف و یادەوەری میدیاکە خۆیەتی.

لە کاتێکدا میدیا بێ ئارشیڤە، لە کاتێکدا هیچ پاشخانێکی ئەوتۆی

نییە بۆی بگەڕێتەوە و پشتی پێ ببەستێ، بەرانبەر بەمە کەسی میدیاکاریش یادەوەرییەکی لاوازی هەیە، بێ دەربەستانە فاکت و ژمارەکان تۆمار دەکات و لە خۆوە شتگەلێک تۆمار دەکات بێ بەڵگە و بێ بنەما. واتا لە کاتێکدا ئارشیف بەتاڵە و ستوونەکانی کار ئامادە نین، بەرانبەر بەمە خەیاڵ و یادەوەریی کارمەندەکەیش ئامادە نین و کۆڵەوارن بەرانبەر بە بەخشینی زانیاری و رووپێوی هەواڵ و رووداوەکان دۆش داماون.

کەم نین ئەو رۆژنامە و سەرنووسیارانەی ناوی شاعیرانی کورد تێکەڵ دەکەن و شیعرەکانیان دەشێوێنن. جا میدیایەک دەسەڵاتی ناسین و باش بەکارهێنانی شیعر و ئەدەبیاتی خۆی نەبێت، دەتوانێ لەم دنیا پڕ زانیارییەی ئەمڕۆدا هەڵبکات؟

میدیای کوردی، میدیایەکی بێ ئەزموونە و بێ ئارشیت. کە بێ ئەزموونە خەیاڵ و یادەوەریشی زۆر لاوازە، کەواتە کێشەکە لای ئەم میدیایە بووە بە کەماسییەکی دوولۆیی وەها تێپەڕاندن و ڕاستکردنەوەی کاری زۆری دەوێ. نەبوونی ئەزموون وای کردووە ئەم میدیایە نە شتەکان باش ببینێت و نە باش بیانخوێنێتەوە. بێ ئەزموونی هەناسەی کارکردن تەنگ دەکات. یەکێک لە دەروازە گەورەکانی کارکردن دادەخات.

ئەزموون یەکێکە لەو ڕەهەندانەی میدیای ئێمە شکی نابات، بەڵام ڕەهەندێکی هەرە ترسناکە. بێ ئارشیڤیش دیارە بێ ئەزموونیی لێ دەکەوێتەوە. هاوشانی نەبوونی ئەزموون، نەبوونی ئارشیف کارەساتێکی دیکەی ئافراندنی میدیایە. بێ ئارشیڤی وا دەکات میدیاکار نەگاتەوە سەر مەسەلە گرنگ و پێویستەکان.

بەکورتی میدیای کوردی، میدیایەکە مجرق، دەجوولێ و هەناسە دەدات، بەڵام جەستەیەکە تا بڵێی نا تەندروست. ئەزموون پەنجەرەیەکە دەبێ هەمیشە لە ماڵی میدیادا ڕووناک و کراوە بێت. بەڵام میدیای ئێمە تا ئێستا ئەم پەنجەرەیەی بەداخراوی هێشتووەتەوە. ئەمە ترسناکترین نەبوونییە. دیاریشە بێ ئارشیڤی و بێ ئەزموونی یەکیان گرت کارەساتی لێ دەکەوێتەوە.

ڕۆبێرت هۆکنەر گوتوویەتی: تۆڵەی ڕۆژنامەوان لە سیاسەتوانان ئارشیڤە. بەڵام ڕۆژنامەوان چی دەکات و چۆن ئەو ململانێیە دەباتەوە کە ئارشیڤی نەبێت؟

## سەرچاوەیەک کە ناچینەوە سەری

پەرداخێک نیوە بەتاڵ (ڤالا) لە مەی، یەکسانە بەپەرداخێک نیوە پڕ. بەڵام نیوە درۆ نیوە ڕاستی لەناو دەبات.

جان کۆکتۆ ١٨٨٩/٧/٥ - ١٩٦٣/١٠/١١

نیگارکێش، دەرهێنەر و نووسەری فەرەنسی

لە ڕاگەیاندنی کوردیدا زۆربەی هەواڵە گرنگەکان بێ سەرچاوەن. سەرچاوەکانیان دیار نین، نایەنەوێ ناویان ئاشکرا بکرێت. هەواڵەکە گرنگە، بەڵام سەرچاوەکەی نا دیارە، سەرچاوەیەکە نایەوێت ناوی خۆی ئاشکرا بکات. دیارە بەمە تێکڕای گرنگی هەواڵەکە بزر دەبێت و ئاشکرانەکردنی سەرچاوە میزاجی خوێنەر "وەرگر" تێک دەدات.

هەواڵی گرنگ کاتێک وەردەگیرێت سەرچاوەی ئاشکرا و بێ لایەنی هەبێت. سەرچاوەیەک "کە نایەوێت ناوی خۆی ئاشکرا بکات" سەرچاوەیەک کە بۆ سۆراخی هەواڵ و پەرەسەندنی ڕووداو ناکرێ بچینەوە سەری، سەرچاوەیەکی چاوبەستە. سەرچاوەیەکە نەبوونی باشترە. سەرچاوەیەکە گومان دروست دەکات. گومانێک نەک هەواڵەکە خۆی، بگرە سەرجەم کاری ئەو ڕۆژنامەیە بەرگومان دەکات.

هەموو دەزانین لە کوردستان هەلومەرجی ژیانی سیاسی هەلومەرجێکە تایبەت. تایبەت بەواتا ئەرێنێکەی نا، بگرە نارۆشن. زۆر شت بەڕووپۆشی ڕەش داپۆشراون. زۆر بویەر و ڕووداو هەن لە

خەڵکی کورد دەشاردرێنەوە. زۆر شتی چارەنووسساز هەن دەشاردرێنەوە و دواتر لە ڕێگەی میدیاگەلی ناکوردییەوە ئاشکرا دەبن. یان ناوەندی سیاسی کوردی و سیاسەتوانی کورد ئەوەندەیان پێ گرنگە لێدوان پێشکێش بەڕۆژنامەوان و کەناڵی ڕاگەیاندنی بیانی بکەن، بەتایبەتی ئەوانەی دەوروبەر "ئەگەر پلە سێ و چوار و لە خوارتریش بن" ئەوەندە بەلایانەوە گرنگ نییە هەواڵ بەڕۆژنامەوانی کورد بدەن و ببن بەسەرچاوەی "ئاشکرا" و سەرچاوەیەکی ناسراو بۆ ڕاگەیاندنی کوردی. سیاسەتوانی کورد تا ئەم ساتەی ئێستامان زۆر مەیلی لە شاردنەوەی شتەکانە، دیارە ئەمە ئەوەندەی لەکاری نا یاسایی و ناجۆرەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەوەندەیش لە کولتوورێکەوە کە کولتووری داپۆشینی شتەکانە. کولتووری تاریکی کە دەیەوێت شتەکان، هەموو شتەکان بەنهێنی مەیسەر بکرێت. ئەوان حەزیان لەوە نییە چاوەکانی دی شتەکانیان ببینن، ئەمە لە کاتێکدا ئەو شتانەی ئەوان دەیکەن پێوەندیی ڕاستەوخۆی بەچارەنووسی خەڵکەوە هەیە. حەزیان لەوە نییە گوێیەکانی دی رازەکانیان ببیستن، لە کاتێکدا هەموو گوێیەکان دەبێ ئەوان و ئەو شتانەی کە دەیڵێن ببیستن.

ڕەوشەکە نا ڕۆشن و نا ئاشکرایە، هەمیشە لە ڕەوشی وەهادا شت لە دەم دەرچوون باجی هەبووە و هەیە. بڵاوکردنەوەی هەواڵی گەرم زۆر بەڵای گەورەی بەدواوەیە. بۆیە سەرچاوەکانی ئێمە زۆربەی جار نادیارن و "نایانەوێت ناویان ئاشکرا بکرێت".

ئەمە هەلومەرجی ئەم وەڵاتەیە، وەڵاتێک سیاسەتوان هیچ بەهایەک بۆ کاری ڕاگەیاندن دانانێت، جگە لە ڕاگەیاندنێک بەمیزاجی ئەو قسە بکات. دیارە ڕاگەیاندنی وەها جگە لە بڵاڤۆکی ناوخۆی حزب شتێکی

دی نییە و هەرگیز پێوەندیی بەکارنامە و ناسنامەی میدیاوە نابێت.

بەڵام سەرباری هەموو ئەم ئاستەنگانەی لە ڕەوشەکەدا هەن، نابێت میدیا کاری نا ڕۆشنانە بکات. نابێت هەواڵ لە سەرچاوەی نادیارەوە بگوازێتەوە ئەوە ڕەوشەکە ئاڵۆزتر دەکات و گومان کەڵەکەتر دەکات و خۆشی دەبێتە بەرگومان.

هەموو دەزانین لە کوردستان هەلومەرجی کاری ڕاگەیاندن زۆر لە سەرەتادایە. نەبوونی ئاژانسی سەربەخۆی دەنگوباس وەهای کردووە هەواڵ بەئاسانی دەست نەکەوێت. ئەو ڕووداوانەیشی دەبن بەهەوێنی هەواڵ، شایانی ئەوە نین وەکو هەواڵی گرنگ یان وەکو هەواڵی سەرنجڕاکێش یاخۆ خۆش و بزەبەخش بڵاو بکرێنەوە.

"جنێوبەخشینەوە دەکەن بەهەواڵ و جێگەی گەورەی دەدەنێ. نامەی پڕ جنێو کۆپی دەکەن و وەکو خۆی بڵاوی دەکەنەوە. سەگێک قەپی گرت لە کەسێک. فلان کەس بەکارەساتی ماشین گیانی لە دەست دا. دوو کەس زەماوەندیان کرد. چی و چی و دیکە؟ ، ئەمانە هەواڵ نین. کاری میدیای پیشەیی ئەمە نییە."

میدیای کوردی دەبێت خۆی بۆ ئەوە ئامادە بکات هەواڵەکانی هەواڵ بن نەک شتێکی تر. سەرچاوەی هەواڵ و لێدوانەکانی ڕوون و ئاشکرا و بێ لایەن بن.

بۆ ئەوەی ڕاستی بەر گومان نەبێت، بۆ ئەوەی نیو ڕاستی و نیو درۆ لە هەواڵێکدا یەک نەگرن، بۆ ئەوەی درۆ ڕاستی لە ناو نەبات، دەبێ ئەو ڕستەیە "سەرچاوەیەک کە نەیویست ناوی خۆی ئاشکرا بکات" لە دارشتنی هەواڵی ڕاگەیاندنی کوردیدا نەمێنێت.

میدیا نابێت درۆی تێدا بێت، درۆی گەورە یان بچووک، کە درۆی تێ کەوت دەبێت بەمیدیایەک وێران و گەندەڵ. فریدریک نیتشە دەڵێ: "لە هەموو دامەزراو و سازمانەکاندا، لە هەموو ئەوانەدا کە بای بەهێزی رەخنەی رای گشتی بەناویاندا تێپەڕ نابێت، گەندەڵی وەکو کەڕووی بێ گوناه گەشە دەکات". ئەمە هەموو دامەزراوەکان دەگرێتەوە، بەمیدیایشەوە.

## کۆبوونەوە و پێشوازییەکانی

ڕاگـەیاندنێکی ئازاد دەکرێ باش بێت یان خـراپ. بەڵام ڕاگەیاندنی بێ ئازادی بێ چەند و چوون خراپە.

ئەلبێرت کامۆ ١٩١٣/١١/٧ - ١٩٦٠/١/٤
نووسەر و فەیلەسووفی فەرەنسی و هەڵگری خەڵاتی نۆبل بۆ ئەدەبیات

بەردەوام پێشوازی و کۆبوونەوە سەردێری هەواڵەکان و لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکانی داگیر کردووە. کۆبوونەوە و پێشوازی کەرەستەیەکی نایابن بۆ ڕاگەیاندنێک کە زۆر بەو شتانە سەرسامە.

ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنی ئێمە دیمەنی ئەو بەرپرسانە پیشان دەدەن کە بەردەوام سەرقاڵی لەهەڤهاتنن بۆ خێری خەڵک، بەڵام ئەو ڕاگەیاندنە هاوکات دەبێ ئامـاژە بەوە بکات کە ئەو خەڵکەیش چۆن سالانێکە ڕۆژانە ژیان بەسەر دەبەن و ڕۆژانە ڕووبەڕووی چ ئاستەنگییەک دەبنەوە.

لە تەلەفزیۆنانەوە، لەو ڕۆژنامانەوە سالانێک کۆبوونەوە وەڕسکەرەکانی ئاشتی بەردەوام پیشان دەدران، لە هەموو کۆبوونەوەکاندا سینی و لەگەنی لێوانلێو لە میوەجات هەبوون، مژاریش باسی کوشتنی گیان و دڵی خۆمان بوو، تیڤی کوردیش بەردەوام و خۆشحالانە ئەو کۆبوونەوانەی ڕووپێو دەکردن و پیشانی دەدان. بابەتیش دێگەڵە بوو. دێگەڵە، درێوترین سنوور لە هەموو دنیادا.

پێشوازی و کۆبوونەوە، کۆبوونەوە و پێشوازی، ئەمە چ ماشینێکی وەرسکەری میدیایە؟ چ وزەیەکە لە ڕووپێوکردنی پێشوازی و کۆبوونەوەی بەرپرسانی حزبی و حکومی بێ تاقەت نابێت؟ سەرنج بدەن بەردەوام میدیای پارتییەکان حزبی و حکومی دەنووسن نەک بەپێچەوانەوە، ئەوە ڕێککەوت نییە، ئەوە بۆ ریتمی نووسین نانووسرێت، بگرە لە باوەڕێکی ناجۆرەوە سەرچاوە دەگرێت، باوەڕێک کە حزب لە پێشەوەی هەموو شتەکانی تری کۆمەڵگەدا پەسەند دەکات.

ڕۆژنامەی حزب، دیارە زۆربەی ڕۆژنامەگەلی کوردی سەر بەحزبەکانن، لاپەڕەی یەکەمی هەموو ژمارە و هەموو ڕۆژێکیان بۆ کۆبوونەوە و پێشوازیی کەسی یەکەم، دووەم و سێیەم و تا کەسی دەیەم تەرخان دەکەن. سەرباری ئەمە باسکردن لە کۆبوونەوەی حزب و حکوومی لاپەڕەیەکی داگیر کردووە، ئایا ئەمە ڕۆژنامەیە؟ ئایا ئەمە هۆیەکە لە هۆیەکانی ڕاگەیاندن؟ ئایا لە وڵاتی ئێمەدا ئەم ڕاگەیاندنە دەسەڵاتی چوارەمە؟

یەکێک لەو هۆیانەی وای کردووە ژمارەی خوێنەری ڕۆژنامەی کوردی بەردەوام ڕوو لە کزی بێت، میدیای حزبییە. ئەم میدیایە ڕۆژانێک میدیایەک بوو پیرۆز چونکە زمانحاڵی دۆزێک بوو، بەڵام کە ئەو دۆزە هاتە هەناوی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکەوە، وەکو هەموو لایەن و بوارەکانی تر، ڕاگەیاندنیش دەبوو خۆی لەگەڵ هەلومەرجێکی نوێدا بسازێنێت کە تەواو جیاوازە لە هەلومەرجی ئەو سەردەمەی زمانحاڵی دۆزێک بوو. خەڵک ئیتر چاوەڕوانیی تری لەو ڕاگەیاندنە هەبوو، هەیە. خەڵک ئیتر زانیاری دیکە و داڕشتنێکی دیکەی لەو میدیایە دەویست، دەوێ.

بەڵام ئەم میدیایە ئەمەی نەکرد، پێی نەکرا، یان نەیانویست بیکەن؟ تەنیا گۆڕینی تەکنیک و جوانکردنی لاپەڕەی ڕۆژنامەکان بەس نین، ناوەڕۆک و جۆری هزرین پێویستن.

میدیایەک خەڵک و کێشەی خەڵکی بەلاوە گرنگ نەبێت، میدیایەک کێشەی سەرەکی و بنەڕەتی خەڵک بخاتە پەراوێزەوە و مانشێت و لاپەڕەی یەکەم بەپێشوازییەکان بدات، خەڵکیش ئەو میدیایە ناخاتە پەراوێزەوە، بگرە ئەو میدیایە لە بیرت دەکات.

لە وڵاتێکدا زۆرینەی بوارەکانی کار و ژیان بێ سیستەم بن، وڵاتێک لێوانلێو بێت لە کێشەی زاگۆنی، کێشەی کۆمەڵایەتی، کێشەی پەروەردە، کێشەی دادپەروەری، لە وڵاتێکدا زۆربەی شتەکان یان لە گرێژنە دەرچوون یاخۆ ڕاپەڕاندنی هەموو کارەکان زۆر سەرەتایین، لە وڵاتێکدا بواری پەروەردە نالەبار، بواری تەندروستی نالەبار و بواری هاتوچۆ و بواری نیشتەجێبوون و بواری، بواری... نالەبار بێت، بۆ کێ کام بێ خەیاڵ، بۆ کام بێ ئاگا و بۆ کام گۆشەگیر ڕاگەیاندنێک دەبێت بەدەسەڵاتی چوارەم کە لە کن وی هەموو ئەم دەردەسەری و ناهەمواریيانەی ژیانی خەڵک و کۆمەڵ شایانی باس نەبن و خەمی سەرەکیی میدیا ڕووپێوکردنی پێشوازی و کۆبوونەوە بێت.

ڕاگەیاندنێک تاکە خەمی کۆبوونەوە و پێشوازییەکان بێت، تەنیا ئەوەی کردبێ بەپەیام و پەیامی تری نەبێت، ڕاگەیاندنێکە باشترە هەرچی زووترە لە کار بکەوێت.

## ڕاگەیاندنی بێ مانشێت

مـرۆڤ بەمـانشـێـتـەکـان دڵی خـوێنەر داگـیـر دەکـات،
بەزانیاریش ڕای دەگرێت.

وەشانکاری بریتانی ئالفرێد چارلس ولیام هـ. ن.

١٨٦٥/٧/١٥ - ١٩٢٢/٨/١٤

میدیای کوردی بە مانشێتەکانی خوێنەر دەورووژێنێ، بەڵام بەناوەڕۆک و زانیـاری خـوێنەر تووشی دڵشکان و سەرلێشێوان دەکات. مـیدیای کوردی دەڕوات و شـوێنێکی نەکردووە بەمەنزڵی مـەبەست. مـیدیایەک بەردەوام دەڕوات بێ ئـەوەی ئامـانجـێکی دیاریکراوی هـەبێت. هـەنگاو دەنێ بێ ئـەوەی پلانی دیار و ئاشکرای هـەبێت. مـیـدیایەک کـە دەبێ پەیامی بـەرچاوڕوونـی و پەیامی کــرانـەوەی پێ بێت، کــەچی خــۆی ناڕوون و خـۆی لـەودیو دەرگە داخـراوەکـانـەوە کـار دەکات. مـیـدیایەک خـۆی ڕێیـە و هـەر خـۆیشـی ڕێبـوار، دەڕوات و خـۆی و خـوێنەرانـی وێڵ دەکات. مـیدیایەک لەبری ئەوەی وتاری پڕ لە زانیـاری لە ژێر مانشـێتی سـەرنجـڕاکێش بووەشـێنێت، کەچی دێت و مـانشـێـتی پڕ لە گێـچەڵ دەبەخشێ و وتاری پـرۆڤـۆکاتیـڤی بێ زانیـاری و وتاری پـڕ پەسنی بێ مـایە و بێ ناوەڕۆکی لێ دەڕژێ. ئـەو مـانشـێـتـانەی ئەمڕۆ سـەرلەبەری سـیـمـای بڵاوکراوەکـانیان داگیر کردووە، سـەرنجـڕاکێش نین، ئەوانە مـانشـێتگەلێکن بەمـەبەسـتی دان ڕووکردن بۆ خـوێنەر و بەئامـانجی هەڵکشـاندنی تیراژ دەنووسـرێن. دیارە مـیدیاکـاران خـۆیان باس لەم

ڕاستییە دەکەن و نایشارنەوە کە مەبەستی ئەوان لە بەرهەمهێنانی ئەو مانشێتانە بەرزکردنەوەی تیراژە. بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە: بۆ دەبێ تیراژ بەم شێوەیە بەرز بکرێتەوە؟

ئەوانە مانشێتی سەرنجڕاکێش نین، ئەوانە مانشێتی گێچەڵ پێکردنن. رستەگەلێکن نابێ لە میدیای سەردەم و پیشەییدا ئامادە بن، بۆ میدیایەک پرستیژ نرخی هەبێت ئەو مانشێتانە نابێ هەرگیز بڵاو بکرێنەوە. مانشێتێک کە ڕاگەیاندنی ڕۆژ دەیکات بەسەردێری پەیام و ئامانجی بەرچاوڕوونی خۆی. دیارە ئەم دیاردەیە زۆرتر لە کن ڕۆژنامەگەلی ئەهلی دەبیندرێت. ئەوان بەو کارەیان هەم خۆیان خستووەتە ژێر گومانێکی قووڵی بەتەم و مژەوە و هەمیش سەرجەم کاری تێگەیشتن و لێک حاڵیبوونیان بەرگومان کردووە.

ڕۆژنامەگەلی ئەهلی هەواڵ و بابەت وەها دەوەشێنن کە بەو کارەیان زۆر جاران لەگەڵ ڕۆژنامەگەلی حزبییانەی سەردەمی شەڕی ناوخۆدا هیچ جیاوازییەکیان نامێنێت. جێگەی داخە ئەو ڕۆژنامە ئەهلییانە کە بەئامانجی کاری میدیایی دەرچوون، ئێستا بوون بە بەشێکی چالاک لە گەمەیەکی گوماناوی و خەمگین، گەمەیەک نابێت میدیا خۆی تێکەڵ بکات. میدیا دەبێ لە پەنجەرەی ڕاستی و متمانەوە بناسرێتەوە. نەک لە ژێر میحرابی گێچەڵ، شەڕفرۆشتن، داچەڵەکاندنی بێ بنەما و بێ بنەڕەتەوە. جگە لەمەیش هەر میدیایەک بۆ پڕفرۆشی و خۆ خۆشەویستکردنی نارەوا پەنا وەبەر هەر هۆیەکی دیکەی دوور لە بنەمای پیشەکەی ببات کارێکە دوور، گەلێ دوور لە کاری میدیا و پرەنسیپەکانی. میدیای کوردی لە بری ئەوەی وێڵی دۆزینەوەی ڕاستییەکان بێت و بەمەراقەوە بیانداتەوە بەخەڵک، کەچی پەنا دەباتە بەر گێچەڵکردنی نا پێویست. ئەمە لە کاتێکدا هۆکاری ڕاگەیاندن

دەکرێ بەچەندین شێوازی شیاو و ڕەوا خۆی خۆشەویست بکات. بۆ ئەوەی خۆشەویست بێت، گەلێری بێت، ڕێگەگەلی ئاسانتر و لەبارتر هەن، چونکە ڕاگەیاندن هۆیەکە لە هۆیە هەرە پێویستەکانی ژیانی نوێ.

ڕۆژنامەوانی کورد لە بری ئەوەی خەیاڵی وەگەڕ بخات و داهێنەرانە هۆکاری ڕاگەیاندن وەگەڕ بخات، کەچی دێت و پێمان دەڵێ: ئەگەر وا نەکەین و مانشێتی گێچەڵ ئامێزمان نەبێت کەس نامانخوێنێتەوە.

ڕۆژی ڕەشی میدیا و ڕۆژی ڕەشتری خوێنەر و خەڵک لێرەوە دەست پێ دەکات کە کاری میدیا لەم بیرکردنەوەیەوە سەرچاوە بگرێت. ئامادەبوونی ڕۆژانەی ئەم جۆرە مانشێتە لە میدیای کوردیدا بووەتە دیاردەیەکی ئاشکرا. دیاردەیەک بۆ خەمخۆرانی میدیا خەمگین. بۆیە بەر لەوەی باس لە دیاردەکە خۆی بکەین، دەبێ پرسیارێک ئاراستەی میدیاکاران بکەین، پرسیارەکەیش ئەوەیە:

کێ خەڵک و خوێنەری بەو شێوازە ڕاهێنا؟ شێوازێکی ڕۆژنامەوانییانەی وەها کە مانشێتی لەو چەشنە پڕ گێچەڵ بەرهەم بێنێت و نووسینی وەها بێ ناوەڕۆکیش بووەشێنێت.

کێ ئەم شێوازی گێچەڵکردنەی کرد بەهۆی خۆ خۆشەویستکردن، خۆ گەلێریکردن و پڕفرۆشی؟ ئایا مەرجی پڕفرۆشی بۆ ڕۆژنامەیەک ئەوەیە گێچەڵ بکات؟ ئایا خوێنەر و چاودێر وەها دروست دەبن بەرهەمی گێچەڵ بن، بەرهەمی وتاری بێ ناوەڕۆک و بێ زانیاری بن؟ کێ لەوە بەرپرسیارە میدیای کوردی میزاجی خوێنەری تێکداوە و خوێنەری بەرەو ئاقارێک بردووە گەڕانەوەی ئاسان نەبێت؟ ئایا میدیای کوردی بەنیازە لە داهاتوودا ببێت بەخاوەنی مانشێت؟

# زمانی میدیای کوردی

مرۆڤ وشە باوەکان بەکار دەهێنێ و شتگەلی نا باو دەڵێت.

ئارتور شۆپنهاوەر ١٧٨٨/٢/٢٢ –
١٨٦٠/٩/٢١ مامۆستای زانستگا،
نووسەر و فەیلەسووفی ئەڵمانی

.... بەڵام میدیای کوردی بەشێواوی وشەی باو بەکار دەهێنێت و قسەی باویش دووبارە دەکاتەوە. میدیای کوردی شتگەلی ناباوی نییە. میدیایەکە رستە باوەکانی کۆمەڵ دەگرێت و ئاڵۆزانە دووبارەیان دەکاتەوە. ئەدەب کاتێک خزمەت بەزمان دەکات و زمان پێش دەخات رستەی باو نەڵێتەوە و رستەی نوێ بئافرێنێت. دیارە ئەمە بۆ میدیایش هەر وەهایە. ئەگەر میدیایەک نەتوانێ بەزمانێکی شیاو و جوان قسە بکات، ناتوانێ زانیارییەکانی بگەیەنێت. میدیای کوردی خاوەنی زمانێکی جوان نییە. نەک هەر زمانی کوردی دەوڵەمەند نەکردووە، نەک هەر زمانی کوردیی پێش نەخستووە، بگرە زیانێکی گەورەی لەو زمانە داوە.

ڕۆژنامەوان و بێژەری ئەڵمانی ڕۆبێرت لێمکە ١٩١٣/٩/١٧ – ١٩٨٩/١/١٥ دەڵێ:

"سەرنووسیاری بەتوانا کەسێکە لەوەدا سەرکەوتوو بێت، کارمەندانی بەشی ئابووری و وەرزش ناچار بکات لە هەواڵەکانیاندا خزمەت بەزمانی ئەڵمانی بکەن."

بێگومان تا ئێستا هیچ سەرنووسیارێکی کورد ئەم هەستە بەکارەکەیەوە دیار نییە. سەرنووسیار زۆرن کە باسی شێوازیی زمانیان لەگەڵدا دەکرێت، دەڵێن بۆ ئێمە زمان زۆر گرنگ نییە، ئەوان پێیان وایە، "خۆیان پێیان وایە" کارێک ئەوان دەیکەن زۆر لە زمان گرنگترە. کاری میدیا چەند پشت بەڕاستی دەبەستێت، ئەوەندەیش بۆ گەیاندنی ڕاستییەکان پێویستی بەزمانی جوان و ڕوونە. میدیای کوردی زمانێکی ڕوون و بێ گرێی نییە تاکو باش لێی حاڵی بین. میدیایەکە بێ زمان. میدیایەکە هەموو ڕێساکانی زمانی پشت گوێ خستووە. ئەمڕۆ لە ڕووبەری ئەو میدیایەدا زمانی کوردی ڕۆژە ڕەشەکانی خۆی دەگوزەرێنێت.

مۆلێر (ژان باپتیستە پۆکوەلین) ١٦٢٢/١/١٤ - ١٦٧٣/٢/١٧ ئەکتەر، دەرهێنەر و نووسەری شانۆی فەرەنسی وتوویەتی:

"ئەوەی وەها قسە دەکات لێی حاڵی بن، هەمیشە جوان قسە دەکات."

ئایا میدیای کوردی وەها قسە دەکات و وەها دەنووسێت خوێنەر لێی حاڵی بێت؟ گومان لەوەدا نییە ئەو میدیایە ئەوەی بەلایەوە گرنگ نەبێت زمانە. میدیای کوردی نەک ئەفسوونی جوانی لە زمانی نووسینیدا نییە، نەک ڕوون نانووسێت و زمانێکی باش و شیاوی نەکردووە بەکەرەستەی نووسین، بگرە زمانیی کوردی بەمەرەیەک بردووە کار و خەباتی زۆر دەوێت تا بێتەوە سەرخۆی.

میدیای کوردی لەبری ئەوەی توانج لە ناوگەلێک بدات و بەشۆخییەوە باسیان بکات کە خەڵک لەم ساڵانەی دواییدا دایانهێناون، کەچی دێت و لە زمانی نووسینی هەواڵ و شرۆڤەی

خۆیدا پەنا دەباتە بەر ئەو ناوانە و بەکاریان دەهێنێت.

بەکارهێنانی ناوی وەکو "شلەخەجێ و گامێش، شەبەح، عفریت و چی و چی بۆ ماشینگەلێک کە ناوی تایبەتی و مارکەی خۆیان هەیە، هیچ نییە جگە لەوەی ئەم میدیایە گۆڕانکاری و هەڵکشانی نەکردووە بەئامانج و ئەو مەنزڵێکی سپی و ڕووناکی مەبەست نییە پێی بگات. سەرباری ئەوەیش بەکارهێنانی وشەی دەفتەر بۆ ١٠٠٠٠ دۆلاری ئەمەریکی، وەرەقە و گەڵا بۆ ١٠٠ دۆلاری و زۆر ناوی تری سەیر کە لە میدیای کوردیدا زۆر بەئاسایی و خۆشدەستانە بەکاردێن، وای کردووە زمانی ئەم میدیایە نەبێت بەزمانێک متمانەی پێ بکرێت و هەرگیز نەبێت بەسەرچاوە بۆ ئێستا و دوارۆژ.

ئەمە جگە لەوەی لە میدیای حزبیدا تا ئێستا ناوەکانی ژن – ئافرەت، قوتابی – خوێندکار و... تاد، هەن و ئەو جیاوازییە هەر ماوە.

جگە لەوەی ساڵانێکی زۆر لەو ڕاگەیاندنەدا بەکارهێنانی کۆمەڵێ وشە و دەستەواژەی دزێو ببوون بەکارێکی زۆر ئاسایی. بەکارهێنانی وشەگەلی دزێو لە ڕاگەیاندنە دا زمان بەشێوەیەکی ترسناک دەشێوێنێت. شێواندنێک ماوەیەکی زۆری پێویستە تا چاکدەکرێتەوە دەکرێتەوە.

هاینریش لاوبە "١٨٠٦/٩/١٨ – ١٨٨٤/٨/١" نووسەر، دراماتورگ و دەرهێنەری شانۆی ئەڵمانی – ئۆتریشی وتوویەتی:

هێرش کردنە سەر زمانی نەتەوەیەک، واتا هێرشکردنە بۆ سەر دڵی.

کەچی میدیای کوردی ڕۆژانە پەلاماری زمانەکەی خۆی دەدات. ئەوە

ئەو میدیایەیە ڕۆژانە دڵی زمان و خوێنەری بەئاگای نەتەوەکەی دەگوشێت.

میدیای کوردی سەرباری ئەوەی زمانی کوردیی شێواندووە، دەستەواژەی جوانیشی نییە، لە ڕستەسازیدا مجرۆیە و لە داڕشتندا زۆر لاوازە. ئایا بەرهەمهێنانی شتگەلی جوان و نووسین بەزمانێکی سەرنجڕاکێشی شیاو بۆ میدیای کوردی غایلەیە؟

میدیای کوردی نەک هەر غایلەی وەهای نییە، بگرە ڕۆژانێک دەژی کە شێواندنی زمان و وێرانکردنی مێرگەکانی زمانی کردووە بەپیشە. ئایا کەسێک هەیە گومان لەو ڕۆژنامەوانە نەکات گوێ بەزمانی نەتەوەکەی نادات؟

ئایا ئەوەی زمانی بەگشتی خۆش نەوێت بەتایبەتیش زمانێک، زمانی زگماکیەتی و بەردەوام زمانی نووسینیەتی، دەتوانێت گوێ بەشتەکانی تر بدات و شتگەلی تری خۆش بوێت؟. بەهیوام ڕۆژنامەوانیی ئێمە ئەوە بزانێت بزرکردنی زمان واتای بزرکردنی هەموو شتەکانە.

# هەڵەی کوشندەی چاپ

هەندێ ڕۆژنامە هەن خۆیان لە خۆیاندا هەڵەی چاپن.

ڤێرنەر شنایدەر ١٩٣٧/١/٢٥ نووسەری بواری

وەرزش و شانۆکاری ئۆتریشی

لە میدیای کوردیدا هەر مەبەست نەپێکان نییە کە هەڵەی کوشندەیە. هەر ئەوە نییە ئەم میدیایە شتی نوێ نابەخشێت. هەر ئەوە نییە ئەم میدیایە ڕۆژانە لە بری زانیاری بەخشین غەمگینمان دەکات. سەرباری کۆمەڵێ کەماسی کە دەبێت تا ئێستا بنبڕ ببوونا، یان دەبوو تا ئێستا چارەسەر ببوونا، هەڵەی کوشندەی چاپیش سەرباری هەموو ئەو کەماسییانە دێت. سەربارێکە باری میدیای ئەوەندەی دیکە لار و خوار کردووە. بەجۆرێک زۆر هەواڵ و زۆر نووسین بەدەست هەڵەی چاپەوە گیر دەخۆن، یان ڕاستتر خوێنەر گیریان بەدەستەوە دەخوات و دەستبەرداری خوێندنەوەیان دەبێت.

چاپکراوی کوردی بەگشتی لە سەردەمی پێشکەوتنی تەکنیکدا زۆرتر تووشی هەڵدێری هەڵەی چاپ دێت. ئەگەر بەراوردێک لە نێوان چاپی ڕابردوو و ئێستای کوردیدا بکرێت. ئەوانەی ئەمڕۆ زۆربەیان لە بەرهەمە دێرینەکان پڕ هەڵەترن. پێشکەوتنی تەکنیک و ئاسانکاریی ئەمڕۆی تەکنیک نەبووەتە هۆی ئەوەی میدیای کوردی ئەو هەڵەی چاپەی لێ نەبارێت.

هەڵەکردنی میدیای کوردی ئیدی بێ سنوور بووە. ئیدی بووە بەشتێکی ئاسایی لای ئەو میدیایە. ڕۆژانە هەڵە دەکرێت، هەڵەی کوشندە دەکرێت. لە نووسینی ناو و شوێندا. لە نووسینی ژمارەدا، لە مێژوودا، هەڵە دەکرێت، لە دانانی وێنەی گونجاو و وێنەی تایبەت بەبابەتی بڵاوکراوە هەڵە دەکرێت.

ڕووی داوە باس لە بڕی تێچوونی پڕۆژەیەک کراوە، بەڵام بەدوو ژمارەی جیاواز باس لە بڕی تێچوونی پڕۆژەکە کراوە. دوو ژمارەی جیاواز لە یەک ڕاپۆرتدا.

جار بەجار لە ڕووبەری ڕۆژنامەکانی ئێمەدا حیساباتی دینار و دۆلار تێکەڵ دەکرێن و خوێنەر ناچێتەوە سەر ڕاستییەکان. دیارە ڕاپۆرتی وەها بەهیچ شێوەیەک ناکرێت ببێت بەسەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوە و لێ حاڵی بوون.

میدیای کوردی بەتەنیا گیرۆدەی هەڵەی چاپ نییە، تەنیا هەڵەی چاپ نییە ئەم میدیایەی بێ پرەستیژ کردووە، بگرە ناڕوونی لە بەکارهێنانی وشە و ناڕوونی لە داڕشتندا وای کردووە ببێت بەمیدیایەک قسە بزڕکێنێت و شتەکان تێکەڵ و پێکەڵ بکات. زۆر جاریش ئەو ناڕوونی و ئەو ڕەوشی داڕشتنە هەڵەی چاپیشی دێتە سەر. جا خوێنەر چۆن ئەمەی بۆ ڕاست دەکرێتەوە و چۆن دەچێتەوە سەر مەبەستەکە؟ ئەوە دەبێت بەکارێکی مەحاڵ و هەوڵدانێکی بێ هوودە.

میدیای ئێمە میدیایەکە داخراو، میدیایەکە توانای کرانەوەی پەنجەرە گرنگەکانی نییە و بەردەوام لە ئاوێکی وەستاو دەچێت. هەر ئەو ڕەوشەیە وای کردووە بەلۆکاڵی بمێنێتەوە. چونکە ئەوە هزری

لۆکاڵییە توانای کرانەوەی پەنجەرەی نوێی تێدا نییە. هزری لۆکاڵی وای کردووە میدیای ئێمە توانای فڕینی زۆر سنووردار بێت. بەڵام سەیر لەوەدایە ئەم میدیا لۆکاڵییە لە ناو سنوورە لۆکاڵییەکەی خۆیشیدا دەکەوێتە هەڵەی کوشندەی وەهاوە ڕۆژنامەوانی بیانیش تێی ناکەوێت. میدیاکە لۆکاڵە، بەڵام لەو سنوورەیشدا کە سنووری کارکردنیەتی دەست و پێ سپی و بێ دەسەڵاتە.

سەرباری کۆمەڵێ کەماسی پشت شکێن کە دەبێ میدیا نەیبێت و بێ ئەو کەماسییانە دەتواندرێت میدیای پێ بگوترێت، ئەم میدیایە هەڵەی چاپی بۆ چارەسەر ناکرێت. هەڵەی چاپ چارەسەرکردنی لە چوارچێوەی توانای تەکنیکی ڕۆژدا گەلێک ئاسانە، تەنیا بەدەربەست بوون و خۆشەویستی کارەکەی دەوێت.

بەکورتی هەڵەی چاپ ڕووی ئەو میدیایەی شێواندووە و شتەکانی ئەوەندەی تر نارۆشن کردووە.

میدیایەک خۆی لە بنەڕەتدا دڵگیر نییە، خۆی هەنگاوێکە شەکەت و لەرزۆک، پێویستی بەدەست گرتن و چالاکانە خستنەگەڕ هەیە، کەچی هەڵەی چاپ ئەوەندەی تر ماندووی دەکات. هەڵەی چاپ میدیایەکی ناکارای ئەوەندەی تر نا کارا کردووە.

# میدیای قسەکەر و گوێ نەگر

خۆنەبانکردن و گوێ نەگرتن، لێبووردەیی نییە

نووسەر و دەرمانسازی ئەڵمانی هاینریش

تیۆدۆر فۆنتانە ١٨١٩/١٢/٣٠ – ١٨٩٨/٩/٢٠

هەموو مرۆڤەکان، ئیدی پلە و شوێنگەیان چ دەبێ با ببێت، پێویستە بەتەنیا قسەکەر نەبن، دەبێ گوێگریش بن. مرۆڤێک بخوازێت تەنیا قسەکەر بێت، مرۆڤێکە نادیموکرات، کەسێکە نەیار و ناحەزی یەکسانی. نابێ قسەکردن بۆ کەسانێ پاوان بکرێت و ئەوانی تریش تەنیا گوهداری بکەن. ئەمە کارێکە دژ بەرێساکانی لێبووردەیی و بەخشندەیی. هەروەها کارێکە دژ بەدیالۆگ. دیالۆگ، شێوازی پێکەوە قسەکردن و پێکەوە ئاخافتنی سەردەم.

ئەوانەی هێز و وزەی گوێگرتن شک نابەن نەخۆشن. نەخۆشییەکی کوشندەیە مرۆڤ نەتوانێ گوێ بگرێت. کە مرۆڤ توانای ئەوەی نەبوو گوێ لە بەرامبەر و دەوروبەر بگرێت، ئیدی کارکردن و پێکەوە هەڵکردن لەتەکیدا دەبێت بەمەحاڵ. ئەوەی گوێ ڕانەدێرێت کارکردن لەگەڵیدا کارێکە بێ هوودە و دارێکە بێ بەر. گوێگرتن خەیاڵ فراوان دەکات و ڕووناهی بەئاسۆی هزر دەبەخشێت.

ئەو کەسانەی توانای گوێگرتنیان نییە، ئەوانەن بەکولتووری دیموکراسی نامۆن. دیارە پەروەردە لەم بوارەدا ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت، بەڵام لە زێدی ئێمە پەروەردە فێربوون و ڕاهێنان و

بارهێنانی ئەم کولتوورەی نەکردووە بەخەم. لای ئێمە پەروەردە رووبەرێکی لە خەیاڵ و لە خەم بۆ فێرکردن و فێربوونی دیالۆگ تەرخان نەکردووە. ئەوە لە چ بیرکردنەوەیەکی ناجۆرەوە سەرچاوە دەگرێت، مرۆڤ بەردەوام قسە بکات، کە نۆرەی بەرامبەرەکەیشی هات خۆی سەرقاڵ بکات، یان خەیاڵی بڕوات و گوێ نەگرێت؟

ئەمە هەڵسوکەوتی کەسانێکە لە دەوروبەری ئێمە بەژمارە کەم نین، بۆیە میدیای ئێمەیش هەمان دەردی گرتووە. میدیای ئێمە میدیایەکە قسەکەر و گوێ نەگر. میدیایەکە خۆی، زۆربەی کارمەندەکانی و زۆربەی ئەو کەسانەیش قسەی بۆ دەکەن، قسەکەرن و ئارەزووی گوێگرتنیان نییە.

خەڵکەکە بەگشتی قسەکەرن. گوێ ناگرن و تەنیا لەسەر ئەو بابەتە دەدوێن کە خۆیان مەبەستیانە. کەسانێک هەن پرسیاری ڕۆژنامەوان هیچ بەلایانەوە گرنگ نییە. هەرگیز بەرسڤی پرسیاری ڕاستەوخۆ نادەنەوە. بەر لەوەی پرسیاریان لێ بکرێت وەڵامی خۆیان دەدەنەوە، دیارە ئەمانە زۆربەیان سیاسی و دەسەڵاتدارن. ئەم بیرکردنەوەیە بووە بەسەرچاوەی هەڵقوڵینی میدیای ئێمە.

بەڵام دەبوو میدیای ئێمە لەو سەرچاوەیەوە نەڕژایەتە ڕۆژەڤەوە. میدیای ئێمە لە بری ئەوەی پرسیاری ژیرانە ئاراستەی ئەو کەسانە بکات، وەڵامی سادە و نابەجێیان بۆ بڵاو دەکاتەوە. زۆرجار سیاسەتوانێک بەپرسیارێک خراوەتە گۆشەیەکەوە، بەڵام کەمێک بیری کردووەتەوە، کاتی دەست خۆی خستووە، ڕاستییەکەی بۆ وەڵام نەگەڕانەوە، بۆ ئەوە گەڕاوە چۆن لە پرسیارەکە هەڵبێت، وەها دەستی پێ کردووە:

پرسیارێکی زۆر گرنگ و قورسە و یەکسەر بابەتەکەی گۆڕیوە، ڕۆژنامەوانەکە چونکە پەسنی خۆی تێدا بووە، چاوی لەوە پۆشیوە بەرانبەرەکە یەکسەر بابەتەکەی گۆڕیوە، بەهەمان شێوە و بەهەمان خواستی ئەو بۆی وەشاندووە. دیارە ئەمەیش هەر لە گوێ نەگرتن و نەبوونی هونەری دیالۆگەوە سەرچاوە دەگرێت.

پێم وایە بەشێکی زۆر لە گوێ نەگرتن لە کن مرۆڤی کورد و پاشان میدیای کوردی لە کولتووری عەرەبییەوە سەرچاوە دەگرێت. نموونەی گوێ نەگرتن لە لای مرۆڤی عەرەب و میدیای عەرەب زۆرن کە خۆیان نەیانەوێت گوێ لە شتێک بگرن، نایگرن هەر چەندێک قسەیان بۆ بکرێت. ئەوە نەبوونی ئەو هونەرەیە لە کن عەرەب وای کردووە یەک کەس پرسیاری نەبێت. کەس وێڵی سازکردنی ڕووبەرێک نەبێت، ڕووبەرێک کە دیموکراسی تێیدا سەردەست بێت.

هەموومان ئاگاداری ئەوە هەین، لە دەمی پرۆسەی ئازادیی عێراقدا و پاشانیش، میدیای عەرەبی بەردەوام ئەو بابەتە دەورووژێنێت کورد لە داگیرکردنی عێراقدا هاوکاری ئەمەریکان، کەچی هەر ئەو میدیایە، کە کەناڵی جەزیرە یەکێک لە دەنگە بڵندەکانیەتی هەرگیز باسی لەوە نەکرد بنکەی سەرکردایەتیی هێزەکانی ئەمریکا لە سیلییەیە و لەوێوە فەرمان دەدرێت عێراق داگیر بکرێت. کەناڵی جەزیرە هەرگیز تیشکی نەخستە سەر ئەو شوێنە. بەڵام هەمان کەناڵ، هەموو عەرەب لە دژی کورد هان دەدا.

میدیای عەرەبی گوێ ناگرێت و بەردەوام قسەکەرە. دیارە ئەوە لە کولتووری عەرەب خۆیەوە سەرچاوەی گرتووە. جێگەی داخە، داخێکی گەورە، میدیای کوردیش لە بن باندۆری میدیای عەرەبیدایە و تەنیا

حەز بەقسە دەکات، نەک گوێگرتن و چاوگێڕان.

دەبوو ڕۆژنامەوانی ئێمە حەزی بەگوێگرتن بوایە، دەبوو مەبەستی بێت گوهداری بکات. ئەوە گوێگرتنە دڵنیایی و پرەستیژ بەکارەکەی دەبەخشێت. میدیاکاری ئێمە کاتێک گوێگرێکی باشە پەسنی بدرێت.

نەدەبوو زۆربەی میدیاکاران ئارەزووی گوێگرتنیان لەوەدا چڕ ببێتەوە، پەسنی خۆیان و کارەکەیان بدرێت. دەبێ ڕۆژنامەوان مەبەستی ئەو پەسنە نەبێت. دەبوو ئەو لەوە حاڵی با ئەو کارێک جێبەجێ دەکات کاری خۆیەتی و دەبێت بیکات.

## خزمەتگوزاری بەردەوام

پێشتر لە شەقامێکی شاری ڤیەننادا چوار نانەواخانە هەبوون. لە پای سەرکەوتن لە ململانێدا، هەریەکە و تابلۆیەکی ڕێکلام ئامێزیان لەبەر دەرگەی نانەواخانەکانیان دانابوو.

یەکەم تابلۆیان لێی نووسرابوو:

بەتامترین نان لە هەموو ڤیەننادا.

دووەمیان بەم ڕستەیە وەڵامی دابووەوە:

خۆشترین نان لە هەموو ئۆتریشدا*

سێیەمیان ئەم ڕێکلامەی خستبووە بەردەست:

باشترین نانی هەموو جیهان.

چوارەمیان زۆر خاکی و سادە، بەڵام پڕ باندۆر** لە تابلۆیەکی ئاساییدا نووسیبووی:

باشترین نانی ئەم شەقامە لێرە دەست دەکەوێت.

**لە چیرۆکێکی کۆنی خەڵکی ڤیەنناوە**

چونکە میدیای کوردی کەرەستەیەکە خراپ بەکار دەهێندرێت، چونکە کەسانێک ئەم هۆیەی ڕاگەیاندنیان بەدەستەوەیە لە ئەرک و گرنگیی کارەکە نەگەیشتوون، چونکە میدیاکاران خەیاڵیان نییە، بۆیە

(*) ئۆتریش، ئوێستەرایش: نەمسا

(**) باندۆر: کاریگەی، تەئسیر

هەرچی بکەن خۆیان و کارەکەیش بەمل هەڵەدا دەبەن. کارمەندانی میدیای کوردی بەردەوام نیشانەکانی مەبەست ناپێکن. بەڵام بۆ خۆیان وایە و پێیان وایە ڕۆژانە نیشانەی مەبەست دەپێکن، ئاخر ئەگەر وەها نەبوایە و ئەو بڕوایەیان نەبوایە بەم شێوە کوشندەیە بەردەوام نەدەبوون.

میدیای ئێمە نەک هەر لە بواری هەواڵ ئامادەکردن، داڕشتنی نووسین و شرۆڤەدا کۆڵەوارە، بگرە لە بواری ڕێکلامیشدا تا بڵێی دەست و پێ سپییە. ئەم میدیایە ڕیکلام بۆ هەر شتێک بکات، نەک هەر بێ ڕەواجی دەکات، بگرە هاوکات لەگەڵ بابەتی ڕیکلامەکەدا کۆمەڵێ شتی دیکەیش لەبەرچاو دەخات و ناشیرینیان دەکات. بەکورتی لە زۆربەی جاراندا ڕێکلام لە میدیای کوردیدا دەبێت بەدژە ڕێکلام (ئانتی ڕێکلام).

"خزمەتگوزاریی بەردەوام" ئەمە دەستەواژەیەکە میدیای کوردی بۆ کۆمەڵگە نۆژەنەکانی نیشتەجێبوون دەیکات. ئەو کۆمەڵگەیانەی لەم چەند ساڵەی پاش نەمانی دەسەڵاتداریتی بەعسدا بنیات دەنرێن.

دروستکردنی کۆمەڵێ گوند بەنێوگەلی "گوندی ئەڵمانی، گوندی ئینگلیزی، گوندی ئیتاڵی و تا" لە شارەکانی کوردستاندا، لە پاڵ کۆمەڵێ واتا و سیمای تریدا، واتای ڕاکردنیشی هەیە لە خزمەتگوزاری بنەڕەتیی خەڵک. واتا هێشتنەوەی ئەو تاریکستان و بێ ئاوییەی خەڵکی تێدایە. هاوکاتیش سازکردنی ڕووبەرێکی ڕووناک و تێر ئاو بۆ لە سەدا یەک یان لە سەدا دووی ئەو شار و ئاوەدانییە. میدیای کوردی لەبری ئەوەی بێت و قسە سەبارەت بەم دیاردەیە بکات، کەچی نەک هەر ئاوڕ لە دیاردەکە ناداتەوە، بگرە ڕێکلامی بێ

ناوەڕۆکی بۆ دەکات. دیارە ڕێکلامێک کە دەرەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە و ئەگەر لێی رابمێنین کەرەستەیەکە بۆ پێکەنین.

لە ڕووپێوکردنی میدیای ئێمەدا بەردەوام باس لەوە دەکرێت لە باڵەخانەکانی ئەو کۆمەڵگەیانەدا خزمەتگوزاریی بەردەوام هەیە. واتا کارەبا و ئاوی بەردەوام هەیە. دیارە ئەمە بەخەیاڵی میدیای ئێمە ڕێکلامە، بەڵام ڕاستییەکەی دژە ڕێکلامێکی کوشندەیە، بۆ شارەوانی، بۆ حکومەت و بۆ سەرجەم بەڕێوەبەرانی وڵات. چونکە لە تەماشاکردنی ئەم ڕێکلامەوە، لە بیستنی ئەو دەستەواژەیەی خزمەتگوزاریی بەردەوامەوە بۆمان دەردەکەوێت لەو وڵاتەدا:

١- دەستەبەرکردنی کارەبا و ئاو کارێکە نزیکە و مەحاڵ. لە کاتێکدا مافی هەمووانە کارەبا و ئاویان هەبێت، بەڵام ئەم ڕێکلامە پێمان دەڵێت کارەبا و ئاو لەو وڵاتەدا چ واتایەکیان هەیە و دەستەبەرکردنیان چەند سەخت و چەند پڕ ئەرکە.

٢- باشە بۆ لەوێ کارەبا و ئاوی بەردەوام هەبێت؟ ئایا لە بەشەکانی تری شارەکە کارەبا و ئاو نین؟ ئەگەر نین هۆکاری نەبوونییەکە چییە؟

٣- کێن ئەوانەی ئەم گوندە نۆژەنانە بنیات دەنێن؟ حکومەت ئەو کارە دەکات یان کۆمپانیای ئەهلی؟

ئەگەر ئەو لایەنانە دەتوانن خزمەتگوزاریی بەردەوام دەستەبەر بکەن، ئەی بۆچی بۆ سەرجەم شارەکە نایکەن و بۆچی تا ئێستا نەیانکردووە؟

٤- ئەم ڕێکلامە وا دەکات مرۆڤ بەتاسانەوە لە ڕاستی ئەو نیشتمانە

ڕابمێنێت و بپرسێت: خزمەتگوزاری بەرەو کوێ دەڕوات و هاولاتییان لە کوێی پلانەکانی دەولەت و حکومەتدان؟ باشە کە خزمەتگوزاریی بەردەوام هەبێت، کەواتە خزمەتگوزاریی پچڕ پچڕیش هەیە.

٥- ئەم ڕێکلامە پێمان دەلێت کۆمەلێ لە ستوونە هەرە گرینگەکانی ژیان، ئاوەدانی و دەولەتداری، کە گرنگترینیان وزە، خزمەتگوزاری و دلنیایین لەو وەلاتەدا بۆ زۆرینە نا ئامادەن.

بەداخەوە میدیای کوردی تا ئێستا لە نرخی ڕێکلام نەگەیشتووە و نازانێ لە شەقامەکەی خۆیدا بانگەشە بۆ شتەکان بکات و دوور نەڕوات. میدیای کوردی دەبوو لە نیشانە دوور نەکەوێتەوە و بۆ تەنیا جارێکیش بێت بتوانێ نیشانەی مەبەست بپێکێت.

میدیایەک نەیتوانیبێ هەوالی ڕاست و شرۆڤەی سەرنجڕاکێش پێشکێش بکات، دیارە لە بواری ڕێکلامیشدا کولەوار و نیشان نەشکێن دەبێت.

## میدیای کوردی لە بەردەم پرسیارە دژوارەکاندا

میدیای عەرەبی وەکو نموونەیەک:

میدیای کوردی لە باشووری کوردستان ئەگەر دووانە نەبێت لەگەڵ میدیای عەرەبی لەو وڵاتە دەستکردەدا، ئەوا هەتا ئەم ساتەیش لەژێر باندۆری قورسی ئەو میدیایە دایە.

ئەمە جێگەی داخە و زیانێکی گەورەی بەمیدیای کوردی گەیاندووە، بەڵام داننەنان بەم ڕاستییەدا یان شاردنەوەی، زیانی زۆرتر بەئێمە و بەمیدیای ئێمە دەگەیەنێت. ئێستا ئێمە لە ڕۆژگارێکداین (مرۆڤی کورد) باس لە جیابوونەوە و سەربەخۆیی دەکات لەو بەشەی کوردستاندا. جیابوونەوە و دابڕان لە دەوڵەتێک جگە لە هەناسەساردی و ڕەنجبێوەری هیچ شتێکی تری بەکورد نەبەخشیوە. بەڵام لەمە گرنگتر و زۆریش گرنگتر بۆ ئێمە دابڕانی هزر و بیرکردنەوەیە. دابڕان لە بیرکردنەوەی فەرمیی دەوڵەتێک کە ئێمەیان بەزۆر تێ ترنجان. دابڕانی بیرکردنەوە و هزرمان لە سیستەمێک بە هیچ جۆرێک هیوای پەسەندکردنی بیر و دیدی جیاوازی لێ ناکرێت. ئەم دابڕانە دەبێ لە هەموو ئەو کەناڵانەوە دەست پێ بکات کە کەناڵی پەروەردەیی و گەیاندنن. یەکێک لە کەناڵە هەرە گرنگەکان بۆ ئەم دابڕانە میدیایە، بەڵام لە کاتێکدا کورد و میدیای کوردی تەواو بەدەست میدیای عەرەبەوە بێزار بوون، کەچی تاکو ئەم ساتە میدیای کوردی بۆ خۆی هەر بەهەمان هزری عەرەبییەوە کار دەکات.

تەلەفزیۆنی عەرەبی لە عێراقدا بەدرێژاییی پەنجا ساڵی کار نەیتوانی بەهیچ شێوازێ کاری پیشەیی "پرۆفیشنال" دەستەبەر بکات. ئەو تەلەفزیۆنە تەنیا لەیەک کاردا پیشەیی و سەرکەوتوو بوون، ئەویش لە پیشاندان و بەرجەستەکردنی هەموو دیدار، کۆبوونەوە و ماجەراکانی سەدام حوسێن دا.

ئەوان بەجۆرێک سیمای دزێوی سەدامیان خستووەتە ڕوو، مرۆڤ یەکسەر میدیا و کاری فیلمی ڕۆژگاری ئەڵمانیای نازیی بیر دەکەوێتەوە، نازییەکان مەبەستیان بوو هەرچی باشتر و لەبارترە وێنەی هیتلەر بخەنە بەر دیدە.

لە گەشەسەندنی میدیادا لەم دوا ساڵانەدا و بڵاوبوونەوەی چەندین ڕۆژنامەی نوێ، سازبوونی دەیان کەناڵی عەرەبی و چەندین کەناڵی کوردی، هەروەها واڵابوونی پەنجەرە داخراوەکانی ئاسمانی بینینی ئێمەیش، کارمەندانی میدیای کوردی بەشێوەیەکی بەرچاو باندۆری کەناڵگەی عەرەبییان تێدا دەبیندرێ.

هەرچەندە گەلی کورد و میدیای کوردیی خۆشیی لەم ساتەدا دزێوی ڕووی شاشەی عەرەبی دەبینن و هەمووان بێز لەو ڕۆڵە نالەبارە دەکەنەوە ئەوان لە سەرەتای شەڕی عێراقەوە تاکو ئێستا یارییان کرد، بەڵام گومان لەوەیشدا نییە زۆرێک لە کارمەندانی بواری ڕاگەیاندنی ئێمە تا ئێستایش لە ژێر باندۆری ڕاستەوخۆی ئەو کەناڵانەدا هەڵسوکەوت دەکەن. ئەم باندۆرە هەر لە دەسپێکەوە تاکو ئەم ساتەی باس لە دابڕان و جیابوونەوە دەکرێت بەشێوەیەکی ئاشکرا دیارە. ئەگەر ئێمە لە ناو جیهانی میدیای عەرەبدا کەناڵی ئەلجەزیرە بەنموونە وەربگرین ئەوا دەکرێت بڵێین: ئەم کەناڵە لە بواری

تەكنیكدا بەشێوازێكی بەرز و پێشكەوتووی سەردەم كار دەكات كە ئیمڕۆ ستانداردی جیهانیی كاری تەلەفزیۆنییە. بەڵام شێوازی كار و بەرجەستەكردنیان ئەوەندە ڕووكەشە بینەر بەئاسانی دەتوانێ لەو گەمە دزێوانە تێ بگات كە خۆیان تێ گلاندووە. كارەساتە كەناڵی جەزیرە سەروەری ئابڕووی نەتەوەی عەرەب لە كەسانی وەكو سەدام، عودەی، قوسەی و عەلی كیمیاویدا بەرجەستە دەكات. كارەساتە تۆ ئەو تەكنیكە لەبارەت لەبەردەستدا بێت، كەچی گۆڕی بەكۆمەڵی هەزاران قوربانی پیشان نەدەیت و بێژەرەكانت شیوەن بۆ كوشتنی عودەی و قوسەی بكەن. كارەساتە لە كاتێكدا ملیۆنان مرۆڤ چاوەڕێی ڕمانی پەیكەرەكانی سەدامن و وەكو مزگێنیی گۆڕانكاریی سەرتاپاگیر لە هەموو ناوچەكەدا هەڵیدەسەنگێنن، كەچی پەیامنێری كەناڵی ئەلجەزیرە باس لە قاچەكانی پەیكەرەكە بكات چۆن بۆیان دەرناكرێت و چۆن بەخاكی بەغداوە پەیوەستن. ئەم هەڵویستانە بەتەنیا بەوە پاساو نادرێنەوە كەناڵی ئەلجەزیرە لە لایەن سەدامییەكانەوە هاتبێتە كڕین. نەخێر بەتەنیا ئەوە بەس نییە، بگرە ئەمە ئاماژەیەكی گەورەی بیركردنەوە و هزرێكە جیهانی عەرەبی سەرتاپا گرتووەتەوە. ئەمە دەنگێكە لە هەناوی ئەوانەوە بەهێز دێتە دەرێ و دەڵێ:

"ئێمە هەمان ئەو نەتەوە سەروەرەین سەدان ساڵ لەمەوبەر پێمان ڕاگەیەنراوە و دەبێ هەمیشە سەروەر بین".

ئەو كەناڵانە بەئاشكرا بەبینەرانی خۆیان دەڵێن: دەبێ ئەو خەونانە بهێنینە دی كە گەلی یەهودی تێدا دەخەینە ئاوەوە و گەلانی تریش دەبێ خواردەستمان بن و لە بری زمانەكەی خۆیان دەبێ زمانە

ئاسمانییەکەی ئێمە بزانن. ئەم بیر و هزرە دۆڕاو و زڕە بەشێوەیەکی چڕ و خەست بەسیمای کاری ئەلجەزیرەوە دیارە. بەرانبەر بەمە ئەو باندۆرە گەورەیەی ئەوانیش بەسیمای ڕاگەیاندنی کوردییەوە دیارە. بەش بەحاڵی خۆم لە دەسپێکی کاری کەناڵگەلی کوردییەوە سێبەری زەقی کەسانی ڕەگەزپەرستی وەکو سامی حەداد، فەیسەڵ ئەلقاسم، محەمەد خەیری ئەلبووڕینی و پەیامنێری وەکو تەیسیر عەلوونی و یوسف ئەلشریف و بەرنامەسازان و بێژەرانی کەناڵی جەزیرە لە شاشەی کەناڵە کوردییەکاندا دەبینم. سێبەری ترسناکی بیر و هزری ئەوان لە شێوەی دانیشتن، پرسیارکردن لە دیکۆر و لە بڵندگۆکانی کەناڵی کوردی دەبینم. ئەوان دەبینم لە جۆری کۆکین، وشە قووتدان، جووڵە و بەکارهێنانی دەست و ئاماژەکانی دەم و چاودا. دەبێ لە هەوڵی دابڕان و جیابوونەوەدا حیسێب بۆ ئەم باندۆرە بکەین، کە بەر لە ئێستا بەسێبەرم ناو برد، بەڵام لە سێبەر دەرچوو و بووە بەپارچەیەک لە هەناوی ڕاگەیاندنی کوردی.

بێژەر و بەرنامەسازانی ئەو کەناڵانەی عەرەب بەشێوەیەکی ئەوەندە نزم و بەزمانێکی هێندە بازاڕی باس لە کێشەی کورد دەکەن، کە جگە لە ڕاڤەکردن لەچوارچێوەی هەستی دوژمنکاری ڕەگەزپەرستیدا، ناچێتە هیچ چوارچێوەیەکی کاری میدیاوە.

چەندین ساڵە ئەم کارمەندانەی میدیای عەرەبی ڕۆژانە پرسیار لە بەرپرسانی کورد دەکەن: .... بەڵام ئێوە دەتانەوێت دەوڵەت دروست بکەن و لە عێراق جیاببنەوە.. وەڵامی ئامادەی بەرپرسانی کورد هەمیشە ئەمە بووە: "نەخێر گەلی کورد نایەوێ دەوڵەتی هەبێت".

بەرانبەر بەمە کارمەندانی میدیای کوردی لە بەرپرسانی کورد

ناپرسن: "ئاخر ئێوە بۆ ناتانەوێ دەوڵەوتی سەربەخۆتان هەبێت؟ ئایا بەڕێزینە ئێوە بۆ لە بری گەلی کورد قسە دەکەن؟ بۆ میدیای کوردی لە ناو خەڵکدا ڕیفراندۆم ساز ناکات و ناپرسێ ئایا گەلی کورد دەیانەوێ دەوڵەتی سەربەخۆیان هەبێ یان نا؟

دەبێ لە باسکردنی باندۆری میدیای عەرەبی ئەوەمان لە یاد نەچێت کە میدیای کوردی بەتەنیا لە ژێر باندۆری لایەنە خراپەکانی میدیای عەرەبیدایە. بۆ نموونە، لایەنێکی لەبەرچاوی میدیای عەرەبی، بەتایبەتی کەناڵی ئەلجەزیرە چالاکبوون و گورجوگۆڵییەتی. ئەم چالاکبوون و خێرایییەی کە ئەلجەزیرە بۆ شێواندن و چەواشەبوون بەکاری دەهێنێت، دەکرێ بەدیوێکی لەباردا بابدرێتەوە. هەموومان لە یادمانە لە دەمی شەڕی ئازادکردنی عێراقدا، ئێمە ناچار بووین دیمەنی شەڕەکان و ڕەوشی کوردستان لە ئەلجەزیرە و کەناڵەکانی ترەوە ببینین. ئەوسا و ئێستایش هەرگیز کەناڵەکانی ئێمە لە خۆیان نەپرسی، ئەرێ کاری ئێمە چییە؟ شەوی ١٨ لەسەر ١٩ ی ئازاری ٢٠٠٣ و کە چەند سەعاتێک بەسەر مۆڵەتەکەی سەرۆکی ئەمەریکادا بۆ سەدام حوسێن و کوڕەکانی تێ پەڕیبوو، کەچی شاشەکانی ئێمە یان خەڵکیان فێری ئەلف و بای کوردی دەکرد یاخود گۆرانی بێ تام و بێ سەروبەریان بڵاو دەکردەوە.

بەم شێوازی کارکردنەی ئێستا هەیە ناتوانین بگەینە هیچ مەبەستێک و ناتوانین هیچ نیشانێک بپێکین. ئایا میدیای کوردی تا کەی بەم شێوازە ناشایان و نالەبارە کار دەکات؟ ئەمە یەکێکە لەو پرسیارانەی ئەگەر لە لایان کفر نەبێت ئەوا لە باشترین باردا وەڵامی نادەنەوە. بەڵام چونکە لە گۆڕەپانی ئێمەدا سەنعەتی میدیاسازی و

کاری تەلەفزیۆنی هەرزان و سووک کراوە، بۆیە ئەم پرسیارانە پرسیاری دژوارن و وەلامدانەوەیان سەختە. چونکە ئەو پەنجەرانەی ئێمە یان لەسەر کچان و کورانی حزب تاپۆ کراون و مینا بارەگا و بیرۆکانی حزب مامەڵەی تێدا دەکرێت و بەهەمان هزرەوە کاری تێدا بەڕێوە دەچێت، یاخۆ کەسانێک هاتوون بەنێوی میدیای ئەهلییەوە مۆدێلێکیان لە میدیا دروست کردووە کە زیانی لە سوودی پترە. بۆیە میدیای کوردی لە ماراتۆنە فراوانەکان و ڕۆژە زۆر خێراکاندا بە دارشەق ڕێ دەکات و دەیەوێ خۆیشی وا پیشان بدا ژمارەی پێوانەییی لەگیرفاندایە. دوای هەموو ئەو نەهامەتییانەی میدیای کوردی خۆی بۆ خۆی دروستی کردوون، پرسیاری مەبەست ئەوەیە: ئایا میدیای کوردی پێویستە خۆی بگۆڕێ؟

وەلام ڕوون و سادەیە، بێگومان، پێویستە سەد لە سەد خۆی بگۆڕێ. بەلام پرسیاری دژوار ئەمەیە: ئایا دەیەوێ خۆی بگۆڕێ؟ باوەڕ ناکەم. چونکە بەو کەرەستەی هزر و بیرەی ئێستا هەیە. بەو کارمەندانەی ئێستا هەن و لەو سنوورە زۆر تەسکەی حزب و بیرکردنەوەی چەوت بۆی کێشاون، خۆگۆڕان سەخت و دژوارە یان ڕاستتر مەحاڵە.

یەکێک لەو شتانەی بەردەوام میدیای عەرەبی، سیاسەتی عەرەبی و بەگشتی خودی مرۆڤی عەرەب بەرانبەر بەکورد و بەو گەلانەی لە لایەن عەرەبەوە زوڵمیان لێ کراوە و خاکیان داگیر کراوە، ئەو قسە هەمیشە بێ واتا و بێ نرخەیە کە دەڵێت:

"با ڕابردوو لە بیر بکەین. ئێمە هەموو موسڵمان و براین".

مرۆڤێک ڕابردوو لە بیر بکات، داهاتووی لە دەست دەدات. ئەوانەی

ئەنفال و کیمیاباران لە بیر دەکەن، ناتوانن سبەینێ ببن بەخاوەن سەروەری و ئازادی. ڕابردوو لە بیرکردن و داهاتوو لە دەستدان لەو وانانەن کە میدیای عەرەبی بەردەوام بەمرۆڤی ناعەرەبی دەڵێتەوە.

بەرانبەر بەمە دەبوو میدیای کوردیش تاکو ئێستا پرسیارگەلێکی دروست بکردایە کە: ئایا ئێمە دەتوانین لە داهاتوودا نەوەیەک ئامادە بکەین، بڵێین لە بیرنەکردنی ڕابردوو دەتوانێ داهاتووی ئارام و دوور لە دڵەڕاوکێمان بۆ مسۆگەر بکات. نەوەی داهاتوو منداڵگەلێک بن بتوانن باس لە ڕابردوو بکەن و ڕەخنەی بوێرانە لە ڕابردوو بگرن. منداڵگەلێک لە چەشتی منداڵانی ئاڵمانیای دوای شەڕی جیهانی دووەم، ئەو منداڵانەی هەمیشە ڕوویان لە دایک و باوکەکانیان دەکرد و لێیان دەپرسین: "بۆچ هاوکاری هیتلەر و نازیییەکانتان کرد؟".

ئایا میدیای کوردی دەتوانێ کارگەلی گەورەی وەها بکات؟

# پادشام له دواتانەوەین

"پادشــام له دواتانەوەین" ئەمــە قــســەی ســەرنووســیــاری ڕۆژنـامـەی حوڕییەتی تورک ئەرتۆغلو ئۆێزکوێکە بۆ سوپاسالاری وڵاتەکەی یەشار بویوککانت. دیارە ئەم دەربڕینە لە دەربڕینی ڕۆژنامەوان ناچێت، زیاتر سـروشتی قسـەی سـەربازێکی هـەس دەستـوپێـوەند و خـزمـەتکاری فـەرمـاندەکەی بێت. بەڵام ئەوەی چاودێریی ڕاگەیاندنی تورکیا بکات دەزانێ ئـەمـە دەربـڕینێکی بەداخـەوە "ئاسـایی"ی ئەو ڕاگـەیاندنـەیە. کـەسـمـان چاودێری سـەرجـەم ڕەنگەکـانی مـیدیای هـەمـوو جیـهـان ناکـەین، بـەڵام دەکرێ بـێ سێ و دوو بڵـێین مـیـدیای تورک یـەکـێک له دزێوترین و ترسناکترین میدیاکانی جیهانە.

"ئەرتوغلو ئۆێزکـویک" سـەرنووسـیـاری ڕۆژنامـەی حـوڕیـیـەتە، ئەو ڕۆژنامەیەی ڕۆژانە سـەری ئەتاتورکی لە تەختی نێوچەوانی خۆی داوە و لە بـنەوەی ئەو وێنـەیە نووسـیـویـەتی تورکـیـا هـی تورکـەکـانـە. ئەم ســەرنووســیــارە لە ژمــارەی ڕۆژی ٢٣/١٠/٢٠٠٧ی حــوڕیــیــەتدا دەنووسێ: دوێنێ بەتەلەفۆن لەگەڵ سوپاسالارمان یەشـار بویوککانتدا قــســەم کــرد و پێم گــوت: پادشـــام لـە دواتانـەوەین. ئـەم پیــاوە ســەرنووســیــاری ڕۆژنامــەیەکــە کــە ڕۆژانـە سێ ملیـۆن دانـەی لێ دەفرۆشـرێت. ئەمـە چ مـیدیایەکە و ئـەو ژمـارە زۆرەی خـوێنـەرانیش چ خوێنەرێکن کـە ئەو ڕۆژنامـەیە دەکـڕن و بەشـەوقـەوە دەی خـوێننەوە؟ دیارە ئـەو پیــاوە ڕۆژنامـــەوانە، ڕۆژێک بەر لـەو قــســەیـەی لەگــەڵ

پادشاکەیدا سەبارەت بەهێرش بۆ سەر گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان نووسیبووی: "ئیتر قسە قسەی فرۆکە جەنگییەکانمانە". پەیامی میدیای تورک پەیامی جەنگ و داگیرکارییە نەک بەپێچەوانەوە. پەیامی ئەوان بۆ چەواشەکارییە. نەک پەیامی گەیاندنی ڕاستی.

کە ئەمە بیرکردنەوە و بەرهەمی میدیای تورک بێت، کە ئەمە بیر و هزری ڕۆژنامەوان و سەرنووسیاری میدیای تورک بێت، ئیدی سروشتییە بیرکردنەوەی جەنەراڵ و سەربازەکانی تورک شالاو بەر و ترسناک بێت.

میدیای تورک هێزێکی کاریگەر و ترسناکە تا ئیمڕۆ چالاکانە لە پشت کەڵەگایی، سەرەڕۆیی و هەڕەشەکانی لەشکری وڵاتەکەیەتی بەرانبەر بەکورد و دەر و دراوسێیەکانیان.

ئەم میدیایە کەرەستەیەکە لە کەرەستە پیسەکانی شەڕ خۆشکردن، شەڕێکی ئەوەندە دزێو ڕەنگ بێ بەهیچ یەکێک لە ئامێرەکانی تری لەشکر جێبەجێ نەبێت. ئەم میدیایە نەک هەر دژ بەنەیارانی دەرەکی، بگرە دژ بەنەیارانی ناوەکیش ئامرازێکی کاریگەرە بەدەست سوپاوە.

ساڵی ١٩٩٤ کاتێک تانسۆ چیللەر سەرۆک وەزیرانی ئەو وڵاتە بوو، داتەپینی ئابووری تورکیای پەرێشان کردبوو. لە سەفەری ئەو دەمەی چیللەردا بۆ ئەمەریکا بەمەبەستی پاڕانەوەی پشتگیری و خواستنی پارە میدیای تورک دەنووسێت: ئایا چیللەر دەتوانێت دڵی کلنتۆن نەرم بکات؟ ئەمە مانشێتی میدیای تورکە سەبارەت بەگەشتی ژنێک کە سەرۆک وەزیرانی وڵاتەکەیانە، دیارە ژنەکەیش وەکو سیاسەتوان لە هەناوی ئەو سیستەمە ناشیرینەوە هاتووەتە دەرێ، چونکە ئەو لە ماوەی کاری خۆیدا سەلماندی لە هەموو پیاوە دڕندەکانی سوپا

درندەترە. لە سەردەمی ئەو ژنەدا کۆمەڵێ دەزگای ترسناکی تری سەرکوتکردن و مرۆڤ کوشتن لە تورکیادا دروست کران. ئەو میدیایە دواتر و هەر لە هەمان دەمدا سەبارەت بەوردەکاری گەشتەکەی چیللەر نووسیبووی: ڕاستییەکەی ئەوان دوو کۆنە هاوڕێی یەکن، چیللەڕی ئێمە و کلنتۆنی ئەوان، ئەم خاتوونەمان دەتوانێت لە یەک دوو شەودا دڵی ئەو پیاوە ڕازی بکات و (میللەت و وەتەن) لەم داتەپینی ئابوورییە ڕزگار بکات. ئەمەیش نموونەیەکی ترە لە بێ پرستیژیی میدیای تورک، ئەو میدیایەی چەندین نەوەی بێ شەرم و بێ ڕەوشتی بەرهەم هێناوە.

میدیای تورک ژەنیاری ئۆرکسترای شەڕە، شەڕێک بۆ پاراستنی پایەکانی دەوڵەتی کەمالیست بەردەوام بەڕێوە دەچێ. ئەو پایانەی جەنەراڵەکان بەرجەستەیان کردووە و هەموو هەوڵێکی ناوەکی و دەرەکی بۆ گۆڕانکاری و چاککاری ڕەت دەکەنەوە.

یەکێکی تر لە ئەرکەکانی ئەم میدیایە ئەوەیە بەردەوام سووکایەتی بەکورد و گەلانی دیکە بکات. لە هەموو جەژن و بۆنەیەکی نەتەوەیی و لە ساڵوەگەڕی مردنی ئەتاتورک و دامەزراندنی کۆمار و هتددا، دەزاندرێت ڕۆژنامەکانی وەکو حورییەت، سەباح و میللەت و تاد، و سەرجەم تەلەفزیۆنەکانیان چەند یەک هارمۆنین و چۆن ئەو میللەتی تورکە بەهەموو ڕەنگە ڕووکەشەکانیانەوە یەک ڕەنگ پێک دەهێنن، کە لە بنەڕەتدا یەک ڕەنگی ترسناک و بەردەوام ئامادەیە بۆ پاراستنی سەروەری و پرەنسیپەکانی کەمالیزم بەهەر شێوەیەک بێت پرەنسیپگەلێک کۆڵەکە گرنگەکانی ڕەتکردنەوەی هەموو شتێکە کە نا تورکی بێت.

# پێڕست

